دەربارەی






# دەروونزانی گشتی

د. ئازاد عەلی

2007

# ناوەڕۆك

| بابەت | لاپەڕە |
| --- | --- |

# پێشەکی

هەندێك لە زانایان دەروونزانی بە زانستی سەدەی بیستەم دادەنێن. هەر چەندە ئەو رایە کەمێك زێدەرەوی تێدایە، بەڵام ئاماژە بۆ گرنگی دەروونزانی دەکات لە ژیانی مرۆڤی هاوچەرخ ولە رۆشنبیری گشتی وئەو بوارانەی کە مرۆڤ، کاریان تێدا دەکات. بەڵام سەرەرای ئەو گرنگییەی دەروونزانی، کتێبخانەی کوردیمان هێشتا هەر هەژارە لەو بوارە وبێجگە لە پێنج شەش کتێبێك هیچی دیکەمان نییە تەنها ئەو وتارانە نەبێت کە ناوە ناوە لە رۆژنامەکانمان بلاودەکرێنەوە وهەرچەندە هەندێکیان جێگای بروا پێ کردن و پشت بەستن نین، بەڵام بە هەر حاڵ لە نەبوون باشترن[1].

لەو پێنج شەش کتێبەی کە لە بواری دەروونزانی هەمانە تەنها کتێبێکیان باسی هەندێك لە بابەتەکانی دەروونزانی گشتی دەکات، ئەوانی تر لە بابەتی تایبەتی دەکۆڵنەوە وەك کەسایەتی و نەخۆشییە دەروونییەکان. خۆ ئەگەر ئەو کتێبانەش دەربارەی دەروونزانی گشتی بان ئەوا سوودێکی زیاتریان دەبوو چونکە لە بلاوکردنەوەی هەر زانستێك دەبێت لە بابەتە گشتی یە کان دەست پێ بکرێت و پاشان بابەتە تایبەتی یەکان. ئەو تەنها کتێبە کە باس لە دەروونزانی گشتی دەکات ناونیشانی "دەروونزانی" یە وهیوا عمر أمین لە زمانی ئینگلیزیەوە بۆ زمانی کوردی وەرگێراوە. هەرچەندە ئەو کتێبە چەند بابەتێکی گرنگی دەروونزانی گشتی تێدا نییە وەك بابەتی مێژووی دەروونزانی ولقەکانی وقوتابخانەکانی ورێگاکانی لێکۆلینەوەی وپالدەرکان و تاوگیری، وە ئەو بابەتانەی کە لە کتێبەکەدا هەن بە شێوەیەکی کورت وچڕ باس کراون، بەڵام لەگەل ئەوشدا کەلێنێکی لە

---

[1] شایەنی باسە کە دەستنووسی ئەو کتێبە لە سالی ١٩٩٠ نووسراوە و لەو کاتەدا کتێبی دەروونزانی گشتی بە زمانی کوردی بە دەگمەن بەدەست دەکەوتن بەلام ئێستا تارادەیێك ژمارەیان زۆر بووە بۆ نمونە کتێبی مامۆستای بەرێز د. کەریم شەریف قەرەچەتانی و مامۆستای بەرێز د. عبد الستار تاهیر شەریف.

کتێبخانەی کوردی دا پڕ کردۆتەوە ومنیش وەك سەرچاوەیەك سوودم لێ وەرگرتووە لە دانانی ئەو کتێبەی بەردەستت.

ئەو کتێبە لە چەند بابەتێکی سەرەتایی دەروونزانی گشتی پێك دێت وبە پێناسینی دەروونزانی ومێژووی ولقەکانی و قوتابخانەکانی دەست پێ دەکات وپاشان باس لە بابەتی ڕێگاکانی لێکۆلینەوە دەکات. لە پاشان بابەتی هەست کردن وئاگاداری و زانین یەك لە دوای یەك دێن ولە دوای ئەو بابەتی پالدەرەکان دێت، ئینجا بابەتی فێربوون وبە بابەتی زیرەك کتێبەکە کۆتایی دێت. ئەو بابەتانەی کە لەو بوارەدا ماون، بە یارمەتی خودا، لە دەرفەتێکی تردا بلاودەکرێنەوە. لە کۆتایی هەر بابەتێك کۆمەڵە پرسیارێکم دارشتووە بۆ ئەوەی خوێنەر خۆی تاقی بکاتەوە وبزانێت تا چ رادەیەك لە بابەتەکە تێگەیشتووە.

لە کۆتاییدا هیوادارم خوێنەر کاتێکی بەسوود لەگەڵ خوێندنەوەی ئەو کتێبەدا بباتە سەر. ئینجا ئەگەر ئەو کتێبە هیچ سوود وکەلکێکی هەبێت ئەوا بۆ ئەو نووسەرانە دەگەرێتەوە کە پشتم بە کتێبەکانیان بەستووە لە دانانی ئەو کتێبە. بە پێچەوانەش، ئەگەر هەر کەم و کورتیەکیشی تێدا هەبێت، کە بێ گومان زۆرن، ئەوا بە هۆی منن و داوای لێبوردن لە خوێنەر دەکەم.

**تێبینی**

هەروەك ئاماژەم پێ کرد، ئەو کتێبە لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی رابوردوو بە دەست نووسراوە. وەك رێبازی زانستی لە نووسین، ئاماژە بۆ سەرچاوەکان کراوە کە پشتم پێ بەستوون بەلام هەندێك جار زانیاری دەربارەی سەرەچاوەکان تەواو نین ولە کاتی چاپ کردنی ئەو کتێبە، پاش تێپەربوونی ١٥ سال لەسەر نووسینی، ئەو سەرچاوانە لە بەر دەست نەبوون بۆ ئەوەی زانیاریە ناتەواوەکان تەواو بکرێن. بۆیە داوی لێبوردن لە خوێنەری بەرێز دەکەم ئەگەر نەیتوانی زانیاری تەواوی هەندێك لە سەرچاوەکانی بەدەست کەوێت کە لەو کتێبە ناویان هاتووە.

نووسەر

# دەروونزانی چی یە؟

مرۆڤ تونێلێکی تاریکە، مەتەڵە، هەر وەك چارلز دیکنز لە رۆمانی "چیرۆکی دوو شارەکە"دەڵێت. وە ئەگەر ئەلیکس کارلیل لە کتێبی "مرۆڤ ئەو بوونەوەرە نادیارەیە" زیاتر مەبەستی لایەنی جەستە ولەشی مرۆڤ بێت، ئەوا لایەنی دەروون وعەقلی مرۆڤ نادیارتر وشاراوەتر وقووڵترە چونکە جەستە ماوەی لێکۆڵینەوەی زانستی راستەوخۆ دەدات، بەڵام دەروون وعەقل ئەو ماوەیەیان زۆر تەسکە چونکە ئەو هۆ وئامێرە زانستیە وردانەی کە لە لێکۆلینەوەی لەش وپێکهێنەرەکانی وفرمانەکانی بەکار دەهێنرێن، وەك میکرۆسکوب بەهەموو جۆرەکانی وتیشکی لێزەر وهۆیەکانی تر، لە لێکۆڵینەوەی دەروون زۆر کەم بەکار دەهێنرێن. هەرچەندە دەروونزانەکان هەوڵیان داوە وهەوڵ دەدەن کە هەرچەند پێیان بکرێت زیاتر ئامێرە زانستیە ووردەکان بەکار بهێنن، بەڵام لەگەڵ ئەوشدا مرۆڤ وەك رازێك یان بیرێك ماوەتەوە کە زۆربەی بەشەکانی ناوەوەی تاریك ونەزانراون.

لەو پێشەکییە کورتەدا، بێگومان خوێنەری هێژا بابەتی دەروونزانی بەدی دەکات وزەحمەتی وئالۆزیشی تێبینی دەکات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێناسە کردنی دەروونزانی کارێکی ئاوەها ئاسان نییە وجیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان دەروونزانەکان لەو بوارەدا. هۆیەکانی ئەو جیاوازیەش ئەمانەن:

١. دەروونزانەکان لە زەمینەی بیرو رۆشنبیری جیاواز دەست پێ دەکەن.

٢. جیاوازی هۆو رێگاکانی لێکۆلینەوە کە بەکاریان دێنن.

٣. جیاوازی بواری لێکۆلینەوەیان.

ئەگەر گوتمان دەروونزانی (واتە سایکۆلۆجی Psychology[١]) زانستێکە دەروونی مرۆڤ دیراسەت دەکات ولێی دەکۆڵێتەوە، ئەوە لەوانەیە رەخنە لەو پێناسەیە بگیرێت و بگوترێت: نەخێر دەروونزانی دیراسەتی دەروون ناکات وپێشی ناکرێت، چونکە دەروون چەمکێکی میتافیزیقی گریمانییە، بەڵکو دیراسەتی شوێنەواری

[١] ئەو زاراویە لە دوو برگە پێك هاتووە: Psycho کە مانای دەروون ونەفس دەدات و logy مانای زانیاری وزانست دەبەخشێت.

دەروون، واتە رەفتار (سلوك)، دەکات. ئەوە لەلایەك، لە لایەکی ترەوە دەروونزانی لە لقێك لە لقەکانی دیراسەتی رەفتاری ئاژەڵیش دەکات. کەواتە ئەو پێناسەی سەرەوە تەواو نییە وگشت لایەنەکانی ئەو زانستە ناگرێتە خۆی. ئەو رەخنەیە کە دەروونزانانی قوتابخانەی رەفتاریەتی (السلوکیە) دەیگرن، بۆ ئەو سێ خاڵە دەگەڕێتەوە کە تازە باسمان کردن.

لە ڕاستی دا پێناسەکانی دەروونزانی زۆرن، بەڵام بە بۆچوونی من نزیکترینیان لە سروشتی زانستەکە ئەو پێناسەیەیە کە دەڵێت:

**"دەروونزانی ئەو زانستەیە لە پێکهێنەرەکانی دەروونی مرۆڤ وگەشەکردنی وشوێنەوارەکانی (واتە رەفتار) وکار تێکردنەکانیان وساغی وناساغیان دەکۆڵێتەوە بە شێوازێکی زانستییانە".**

بۆ ئەوەی ناوەڕۆکی ئەو پێناسەیە روونتر بێت دەڵێین دەربوون مەڵبەندی هۆش وهەست وژیری ویادگارییە وکانگای پێویستی وپاڵدەر وبیرۆکەکانە. ئەوانە پێکهێنەرەکانی دەروونن وبێ گومان ئەو پێکهێنەرانە گەشە دەکەن رلە شێوەیەکی سادەوە دەگۆڕێن بۆ شێوەیەکی ئاڵۆز. ئەو دیاردەیەش بوارێکی فرەوانی لە دەروونزانی داگیر کردووە کە دیراسەتی گەشە کردنی ئەو پێکهێنەرانە دەکات لە پێش لەدایك بوونی مرۆڤ هەتا مردنی. ئەو پێکهێنەرانە کار لەیەکتر دەکەن وبەو شێوەیە زەمینەیەکی بەپێز پەیدا دەکەن بۆ لێکۆڵینەوەی بابەتی کەسایەتی وپاڵدەرەکان. ئەو دوو بابەتەش پەیوەندییەکی هۆبەکییان بە لایەنی ساغی وناساغی دەروون هەیە کە چەند لقێکی تایبەتمەند ئەرکی لێکۆڵینەوەی حستۆتە سەر شانی وەك لقی (دەروونزانی کلینیکی) کە بایەخ بەپشێوی دەروون ورەفتار دەدات بەتایبەتی لایەنی هۆیەکانیان ورێگای چارەسەرکردنیان. ئەوەی ڕاستی بێت خەڵکێکی زۆر کە گوێیان لە ووشەی دەروونزانی دەبێت یەکسەر بیریان بۆ ئەو بوارە دەچێت هەرچەندە ئەو بوارە، لە وڵاتی ئێمە تەسکترین بواری دەروونزانی یە، بەڵام لە وڵاتە پێشکەوتووەکان دەورێکی گرنگ دەبینێت ل. چارەسەرکردنی هەندێك لەو ناهەمواریە دەروونییانەی کە مرۆڤ لە کۆمەڵگاکانیان تووشیان دەبێت.

دەروونزانی، وەك زانستە سروشتییەكان، رێبازی زانستی پەیڕەو دەكات لە لێكۆڵینەوەی بابەتەكانی. وە هەر رێبازێك بابەت و بواری تایبەتی خۆی هەیە كە زیاتر لە بابەت وبوارەكانی تر بۆی دەشێت. هەروەك زۆربەی زانستەكان گریمانە وبیردۆز ورای جیاوازیان تێدا هەیە، دەروونزانی لەو دیاردەیە بەدەر نییە. جیاوازی لە بیردۆز وڕاو بۆچوون لە هەموو بوارەكانی دەروونزانی تێبینی دەكرێت. ئەو بیردۆز وبۆچوونانە هەندێكیان ڕاستن و هەندێكی تریان چەوتن وهەروەها تیایاندا هەیە كە نیوەی ڕاستە ونیوەی چەوت. هیوادارم، لە دوای ئەو روون كردنەوەیە، وەڵامی پرسیاری: دەروونزانی چییە؟ كەمێك رۆشنای كەوتە سەر و چەند لایەنێكی روون بۆوە.

**خۆت تاقی بكەوە!**

١. پێناسە كردنی دەروونزانی كارێكی ئاوەها ئاسان نییە وجیاوازیەكی زۆر هەیە لە نێوان دەروونزانەكان لەو بوارەدا. هۆیەكانی ئەو جیاوازیە چین؟
٢. زاراوەی سایكۆلۆجی لە چییەوە هاتووە؟
٣. دەروونزانی زانستێكە دیراسەتی دەروونی مرۆڤ دەكات. چ رەخنەیەك ئاراستەی ئەم پێناسەیە دەكرێت؟
٤. بە بۆچوونی نووسەر، شیاوترین پێناسە بۆ دەروونزانی چییە؟ وبۆچی؟

# کورته مێژوویەکی دەروونزانی

فەلسەفە بە دایکی گشت زانستەکان حسێب کراوە وبەشێوەیەکی گشتی کە باس لە مێژووی دەروونزانی دەکرێت یەکەم قۆناغی بە فەیلەسوفە یۆنانیە کۆنەکان دەست پێ دەکرێت. لەو کتێبە ئێمەش ئەو ڕێبازە پەیرەو دەکەین و بە فەلسەفەی یۆنانی دەست پێ دەکەین.

فەیلەسوفە کۆنەکانی یۆنان، پێش سوکرات، بایەخێکی ئەوتۆیان بە دەروونزانی نەداوە کە شایەنی باس بێت[1]. بەڵکو زۆربەی لێکۆڵینەوەیان دەربارەی سروشت وتەفسیر کردنی دیاردەکانی بوو. بە هاتنی سوکرات وئەفلاتون وئەرستۆ، بایەخ دان بە دەروونی مرۆڤ پەرەی سەند وفەلسەفەش مرۆڤی کردە بابەتی دیراسە ولێکۆلینەوە بۆیە وا گوتراوە کە سوکرات فەلسەفەی لە ئاسمان دابەزاند بۆ سەر زەوی.

ئەرستۆ یەکەم فەیلەسوفی یۆنانی بوو کە هەوڵێکی فیکری ڕێك وپێکی دا بۆ دیراسەت کردنی هەستیارەکان ودابەشکردنیان بۆ: هەستیارە دیارەکان، وەك بینین و تام کردن و بیستن وهتد، وهەستیارە نادیارەکان وەك عەقلی گشتی (بە زمانی ئینگلیزی پێی دەڵێن: Common sense) ویادکردنەوە ودالفە لێدان. ئەرستۆ کتێبێکی تایبەتی نووسی لە ژێر ناونیشانی "دەروون" (یان بە زمانی یۆنانی: De anima ) کە تیایدا دەروونی بۆ سێ جۆر دابەش کرد:

١. دەروونی گەشەکردوو، کە گشتی یە واتە لای هەموو زیندەوەرەکان هەیە وەك ڕووەك وئاژەل ومرۆڤ.
٢. دەروونی هەست کردوو، کە تەنها لای ئاژەڵ ومرۆڤ هەیە.
٣. دەروونی قسە کردوو، یان ژیر، کە تایبەتە بە مرۆڤ.

---

[1] ئەوە مانای ئەوە نی یە کە هیچ ڕا وبۆچوونێکیان نەبووە دەربارەی دەروون وعەقل بەڵکو مانای وایە کە دەروون وعەقلیان بە کێشەیەکی سەرەکی دانەناوە. بۆ زانینی بیروڕایان دەربارەی دەروون وعەقل بڕوانە کتێبی: "النفس الانسانیه".

لەبەر ئەوجۆرە دابەشکردنەی سەرەوەیە کە پێناسە کردنی مرۆڤـ وەك ئاژەڵێکی قسەکەر دەخرێتە پاڵ ئەرستۆ. وە ئەوەی شایەنی باسە، زاراوەی گیان ودەروون وعەقل لای ئەرستۆ یەك شتن ودەروون بریتی لە زیندەفرمانەکانی (الوظائف الحيوية) زیندەوەر.

پاش ئەرستۆ چەند قوتابخانەیەکی فەلسەفی سەریان هەڵدا بۆنمونە قوتابخانەی بەرهەیوانەکان (الرواقيون) کە زینۆن دامەزرێنەری بوو. بۆچوونی ئەو قوتابخانەیە وابوو کە توانای بیرکردنەوە زگماکی ورەمەکییە وئەو زانیاریانەی کە هەمانە هەموویان بە هۆی ئەندامەکانی هەست پێمان دەگەن.

پاش لە دایك بوونی عیسا (سەلامی خوای لە سەر بێ) چەند فەیلەسوفێك هەوڵیان دا کە فەلسەفە، بەتایبەتی فەلسەفی ئەرستۆ، بە ئاینی مەسیحی تێکەڵ بکەن. بەناوبانگترین فەیلەسوف لەو بوارە (ئۆگستین) و(تۆماس) و(پۆلس) بوون بەڵام ئەوەی راستی بێت هیچ شتێکی تازەیان نەهێنا لە بواری دەروونزانی بێجگە لە ڕەنگدانەوەی بیر وبۆچوونەکانی ئەرستۆ نەبێت.

لە دوای هاتنی ئاینی ئیسلام، فەیلەسوفە موسڵمانەکان بایەخێکی باشیان بە دەروونزانی دا وبە تایبەتی پاش وەرگێڕانی کتێبەکانی ئەفلاتون وئەرستۆ بۆ زمانی عەرەبی. ئەوەش کارێکی زۆری لێکردن بەڵام وەنەبێ بیرو بۆچوونیان تەنها رەنگدانەوەی فەلسەفەی ئەفلاتون وئەرستۆ بووبێت هەر وەك لای زۆربەی فەیلەسوفە رۆمانیەکان. هەندێك لە فەیلەسوفە موسلمانەکان، بۆ نمونە ابن رشد، هەولێکی فیکری باشیان دا بۆ لەیەك نزیك کردنەوەی فەلسەفەی ئەرستۆ لە ئاینی ئیسلام، بەڵام هەندێکی تر لە فەیلەسوفەکان تەنها لە روانگەیەکی ئایینی یەوە لە دەروونی مرۆڤیان کۆلیەوە کە (الغزالي) بەناوبانگترینیانە وهەندێك لە نووسەرەکان بە دامەزرێنەری دەروونزانی ئیسلامی دایدەنێن[٢]. وە لە بەر ئەوەی فەیلەسوفە موسلمانەکان بەرهەمێکی فیکری زۆریان لە بواری دەروونزانی پێش کەش کردووە، ناتوانین بە درێژی باسیان لێوە بکەین بەڵام بە کورتی دەتوانین ئاماژە بۆ ئەوە

---

[٢] الدراسات النفسية عند المسلمين والغزالي بوجه خاص، عبد الكريم العثمان، مكتبة وهبة، ط١، ١٩٦٣.

بکه‌ین که ئه‌و فه‌یله‌سوفانه سه‌باره‌ت به پێناسه‌ی ده‌روون له‌گه‌ل ئه‌رستۆ هاوده‌نگن به‌لآم ده‌رباره‌ی سروشتی ده‌روون وپه‌یوه‌ندی به له‌ش ومه‌سه‌له‌ی نه‌مری، جیاوازیان له‌گه‌لّ ئه‌رستۆدا هه‌یه[٣].

له سه‌رده‌می رینه‌سانس زانسته‌کان به‌گشتی به‌ره‌و پێش هانگاویان نا وده‌روونزانیش له‌سه‌ر ده‌ستی فه‌یله‌سوفی فه‌ره‌نسی (رینێ دیکارت) سه‌ر له‌نوێ بووژاوه پاش کزبوونی. به‌لآم ئه‌وه‌ی شایه‌نی باس بێت ده‌روونزانی تا ئه‌و کاتیش هێشتا له فه‌لسه‌فه جوودا نه‌بووبۆوه. چونکه دیکارت کاریگه‌ریه‌کی زۆری هه‌بوو له‌سه‌ر فه‌لسه‌فه وده‌روونزانی وزانستی پزیشکی، له خواره‌وه به کورتی باسی چه‌ند خالێکی سه‌ره‌کی ده‌که‌ین له فیکری ئه‌و فه‌یله‌سوفه به تایبه‌تی ئه‌وانه‌ی په‌یوه‌ندیان به ده‌روونزانیه‌وه هه‌یه.

دیکارت زینده‌وه‌ری به ئامێرێکی ئالۆز داناوه که ده‌نگ ورووناکی وکارلێکه‌ره ده‌ره‌کییه‌کان کاری لێ ده‌که‌ن، وجیاوازی مرۆڤ له ئاژه‌لّ له‌وه‌دایه که ره‌فتاری ئاژه‌لّ له‌سه‌ر بناغه‌یه‌کی میکانیکی دامه‌زراوه، واته وه‌ك ئامێرێك ره‌فتار ده‌كات، به‌لام ره‌فتاری مرۆڤ سه‌رچاوه‌که‌ی عه‌قله و فرمانی عه‌قلیش، له لای مرۆڤ، هه‌ست کردنه (واته شعور[٤]). وه‌هه‌روه‌ها پێی وابوو که عه‌قل و جه‌سته هه‌ر یه‌که کیانێکی سه‌ربه‌خۆن وله تاژه‌گلاند (الغدة الصنوبرية)، که ده‌که‌وێته مێشکی مرۆڤ، یه‌کتر ده‌گرن. ره‌فتار (سلوك) یش، به بۆچوونی دیکارت، بریتییه له کاردانه‌وه (الارتكاس) که له ئه‌نجامی جولانه‌وه‌ی شله‌یه‌که که به ئه‌ندامی هه‌ستدا تێده‌په‌رێت له رێگای ده‌ماره‌کان که پرن له (گیانه زینده‌وه‌ره‌کان) تا ده‌گاته مێشك وپاشانیش له مێشکه‌وه ده‌چێت بۆ ئه‌ندامه‌کانی تری له‌ش.

---

[٣] بروانه کتێبی: في النفس والعقل لفلاسفة الإغريق والإسلام، د. محمود قاسم، مكتبة الأنجلو المصرية، ط٢، ١٩٥٤.

[٤] مامۆستا مسعود محمد له کتێبی "زاراوه‌سازی پێوانه" پێشنیار ده‌کات که وشه‌ی (نه‌ست) به‌کاربهێنرێت به‌رامبه‌ر ووشه‌ی (شعور) له زمانی عه‌ره‌بی و وشه‌ی (هه‌ست) یش به‌رامبه‌ر وشه‌ی (احساس).

گرنگی دیکارت لە مێژووی دەروونزانی لەوە دایە کە لە چەند باس وبابەتێکی نوێی دەروونزانی کۆڵیەوە وەك بابەتی هەست. ئەوەش وای لە دەروونزانەکان کرد کە دیراسەی هەست بکەن لە جیاتی دیراسە کردنی عەقل و لەبەر جەخت کردنی دیکارت لەسەر مێشك، بە دامەزرێنەری دەروونزانی فسیۆلۆژی دەژمێردرێت.

وەنەبێ ئەو بیر وبۆچوونەی دیکارت هەڵنسەنگێرابێت ورەخنەی لێ نەگیرا بێت لە لایەن فەیلەسوفەکانی ئەو سەردەم، بۆ نمونە فەیلەسوفی ئینگلیزی جۆن لۆك بڕوای وابوو کە کاتێك مرۆڤ لە دایك دەبێت عەقلی بریتییە لە لاپەڕیەکی سپی، ( Tabula Rasa)، وگشت زانیاریەکان بەرهەمی شارەزایی (الخبرة) یە وبیرکردنەوەی مرۆڤن. ئەو شارەزایەش بریتییە لە یەککگرتنی هەستەکان، لە رێگای ئەندامی هەست: چاو، گوێچکە وهتد.. ولە هەمان کاتدا بیریش بریتییە لە بەرهەمی تجرید کردنی ئەو شارەزاییانەیە. چەند فەیلەسوفێکی تریش هەن کە هاوڕای (لوك)ن وبەناوبانگترینیان (تۆماس هۆبز) و(دێڤید هیوٚم) و(جۆرج بارکلی)ن. ئەوەی راستی بێت ئەو فەیلەسوفانە بە کۆمەڵەی بەستن (الربط) دەژمێردرێن کە بە کۆنترین قوتابخانە لە دەروونزانی دادەنرێت و زۆربەی بیر وبۆچوونیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەرستۆی فەیلەسوف.

لە کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم زانستە سروشتییەکان چەند هەنگاوێکی گەورەیان بەرەو پێشەوە هاوێشت بە تایبەتی فسیۆلۆژیا کە پەیوەندیەکی بەهێزی لەگەل دەروونزانیدا هەیە. ئەو تۆژینەوانەی کە پەیوەندیان بە سروشتی مێشك وکارکردنی هەبوو پەردەیان لەسەر زۆر لە زانیاریەکان لادا، بۆ نمونە (چارلز بێل) دەمارەکانی دابەش کرد بۆ دوو جۆر: هەستی وبزوێنەر. چەندەها زانای تریش لەو بوارە خزمەتیان کردووە وەك (پییێر فلۆرەنس) و(مارشال هۆل) و(ڤێبەر) و(هێلمۆهێلتن). لێکۆڵینەوانەی ئەو زانایانە پەیوەندییەکی بەهێزی نێوان دەروون وجەستە بەدیار خست. بەڵام ئەوەی کە دەروونزانی پێش خست و وای کرد کە جێگای خۆی لە نێوان زانستەکان بکاتەوە ئەو تاقیکردنەوە وئەزموونە دەروونییانە بوون کە دەروونزانەکان ئەنجامیاندا. شایەنی باسە یەکەم تاقیگەی دەروونزانی لە شاری لایبزگی ئەڵمانی دامەزرا لە ساڵی ١٨٧٩ لە لایەن ولیەم ڤۆنت

کە چەندەها تاقیکردنەوەی کرد بۆ دۆزینەوەی کاری دەنگ ورووناکی وهەست کردن بە ئازار، لە ڕێگای بەکار هێنانی شێوازی تێڕامان. مەبەستی ڤۆنت وهاوڕێکانی بریتی بوو لە شیکردنەوەی شارەزایی هەستی (الخبرة الحسية) بۆ توخمە سەرەکییەکانی وەك هەست وزانین وهەڵچوون (انفعال) وشتی تر. لەو کاتەوە دەروونزانی سەربەخۆیی بەدەست هێنا ولە فەلسەفە جودا بۆوە بەتایبەتی پاش بەکار هێنانی ئامار (الاحصاء) لە بابەتە دەروونییەکان وەك بابەتی زیرەکی. ئەو زانایانەی لەو بوارە ناوبانگیان دەرکرد بریتی بوون لە (فرانسیس گالتۆن) و(کارل پیێرسون) کە بناغەی ئاماری دەروونزانیان دامەزراند لە بواری زیرەکی و چەندەها بواری تریش. وهەر لەبواری زیرەکی چەند دەروونزانێکی فەرەنسی بایەخێکی زۆریان دا بەو کەسانەی کە ئاستی ژیریان نزمە بۆ نمونە (ئەسکرۆل) و(سێگوین) و(ئیتارد). ولە ئەنجامدا دوو دەروونزانی فەرەنسی کە بریتی بوون لە (بینێ) و(سیمۆن) هەڵستان بە دانانی یەکەم پێوەری زیرەکی. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش ، (کاتل) چەند تاقی کردنەوەیەکی بۆ پێوانی زیرەکی داهێنا.

دیارە کە باسی وڵاتانی ئەڵمانیا وفەرەنسا ووڵاتە یەکگرتووەکان دەکەین لەو کورتە مێژووییەدا، مەبەستمان ئەوە نییە کە بزووتنەوەی دەروونزانی لە وڵاتەکانی تری وەك یەکێتی شورەوی (کۆن) هیچ پێشکەوتنێکی بەخۆیەوە نەدیبێت. ئەوەی ڕاستی بێت لە یەکێتی شورەوی چەندەها زانا سەریان هەڵدا و خزمەتێکی گەورەی دەروونزانیان کرد بۆ نمونە (بەختریف) و(پاڤلۆڤ) (ڤیگۆتسکی) وچەندەها زانای تریش کە بناغەی دەروونزانی سۆڤیەتیان دامەزراند.

ئەوەی ڕاستی بێت دەروونزانی تەنها لەم بوارانە پێش نەکەوت بەڵکو لە ئەنجامی تێکەڵ بوون و پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵناسی، دەروونزانی کۆمەڵایەتی پەرەی سەند وچەندەها زانای ناودار بەشداریان لەو پرۆسەیە کرد بۆ نمونە (دۆرکهایم) و(ماکدوگاڵ). ستناڵی هۆل و چەندەهای زانای تر بەشداریان کرد لە دامەزراندی بواری دەروونزانی نائاساییەکان وهەندێك دەروونزانی تر وەك (شارکۆ) و(فرۆید) و(جانێ) و(مینینگەر) و(یۆنگ) و(ئادلەر) بەشداریان کرد لە دامەزراندنی چەندەها قوتابخانە کە زیاتر دیراسەتی نەخۆشیە دەروونییەکانی دەکرد وبەشێوەیەکی

پراکتیکی هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدا هەر یەکە بە پێی بۆچوونی قوتابخانە تایبەتیەکەی خۆی.

**خۆت تاقی بکەوە!**

١. باسی ڕۆڵی ئەرستۆ بکە لە دیراسەکردنی دەروونزانی.

٢. زانا موسڵمانەکان چ ڕۆڵێکیان بینی لە پێشخستنی دەروونزانی؟

٣. باسی بۆچوونی ڕینێ دیکارت بکە سەبارەت بە دەروونی مرۆڤ؟ گرنگترین ئەو فەیلەسوفانە کێ بوون کە ڕەخنەیان لە بۆچوونەکەی گرت؟

٤. چ ساڵێك بە ساڵی لەدایك بوونی دەروونزانی دادەنرێت وەك زانستێکی سەربەخۆ؟ کێ ڕۆلی سەرەکی تیادا بینی؟

# قوتابخانەکانی دەروونزانی

پاش ئەوەی دەروونزانی پێشکەوت وبوارەکانی فرەوان بوون وچەندەها بیردۆز وبۆچوونی تیادا پێشکەش کرا، هەر کۆمەڵێك لە دەروونزانەکان خۆیان بە بیردۆزێك یان چەند بیردۆزێك بەستەوە ونووسین ولێکۆڵینەوەیان لە بواری تایبەتی خۆیان بە پێی ئەو بیردۆزە یان بیردۆزانە ئەنجامدا. بەڵام پێش ئەوەی بێینە سەر ژماردنی قوتابخانەکانی دەروونزانی، پێویستە پێناسەی زاراوەی قوتابخانە بکەین.

قوتابخانەی دەروونزانی، هەروەك دکتۆر فاخر عاقل پێناسەی کردووە، "بریتییە لە کۆمەڵە زانایەك کە چەند بیروڕایەکی رێك وپێك پێش کەش دەکەن بۆ دیاری کردنی ئەو رێگایەی کە پێویستە دەروونزانی بیگرێتە بەر بۆ ئەوەی ببێتە زانستێکی رەسەن وبەرهەمدار وبەهادار چ لە بواری تیۆری (نظري) وچ لە بواری پراکتیکی (عملی)"[1].

قوتابخانەکانی دەروونزانی جیاوازیەکی زۆریان لە نێوان یەکتردا هەیە ئەوەش بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی ئەو بیروڕایانەی کە هەر قوتابخانەیەك لەسەریان دامەزراوە، بەڵام هەندێك جار لە چەند بابەتێکدا لە یەکتر نزیك دەبنەوە. شایەنی باسە کە ژمارەی قوتابخانەکان لە نووسەرێکەوە بۆ نووسەرێکی تر دەگۆڕێت، هەرچەندە ئەو مەسەلەیە هیچ لە واقعی هەر قوتابخانەیەك ناگۆڕێت، بۆ نمونە بنووس هەن کە شێوازی شیکردنەوەی هۆکارەکان (تحليل العوامل) بە قوتابخانەیەکی سەربەخۆ دەژمێرن[2]. هەروەها ئەگەر قوتابخانەیەك هەندێك گۆڕانی بەسەردا بێت ئەوا بۆ قوتابخانەی کۆن ونوێ دابەش دەکرێت. لەو کتێبەدا شێوازی شیکردنەوەی هۆکارەکان بە رێبازێکی لێکۆڵینەوەی ئاماری دانراوە وهەوڵ دەدەین دوور بکەوینەوە لە دابەش کردنی قوتابخانەکان بۆ کۆن ونوێ بۆ ئەوەی باسەکە لای خوێنەر ئاڵۆز نەبێت.

---

[1] مدارس علم النفس، د. فاخر عاقل، بيروت: دار العلم للملايين، ط٤، ص١٣.

[2] أصول علم النفس، د. أحمد عزت راجح، ص٦٥.

هەر قوتابخانەیەکی دەروونزانی بابەتێك یان دیاردەیەکی دەروونی کردۆتە چەقی لێکۆلینەوەی بەتایبەتی لە سەرەتای دروست بوونیدا. بۆ نمونە قوتابخانەی شیکاری دەروونی چەقی لێکۆلینەوەی بابەتی نەخۆشیە دەروونیەکان بوو، بەلاّم قوتابخانەی گشتالّت دیاردەی زانین بابەتی سەرەکی بوو. لەبەر ئەوە هەر قوتابخانەیەك رێگایەکی تایبەتی بۆ لێکۆلینەوە داهێنا بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە لەگەل سروشتی بابەتە سەرەکییەکەی بگونجێت.

دیارە مەرج نییە ئەو بیرورا وبیردۆزانەی قوتابخانەکانی دەروونزانی پێشکەشمان دەکەن هەموویان راست وتەواو بن بەلّکو هەلّە وچەوتیان تێدایە. لەبەر ئەوە دەبێت خوێنەر ئارام بگرێت لە کاتی خوێندنەوەی قوتابخانەکان، وەهەروەها گشت ئەو بابەتانەی کە لە دوای ئەوەوە دێن، وزوو بە زوو بریاری راستی وچەوتیان لەسەر نەدات بەبێ ئەوەی هەموو ورد ودرشتێك دەربارەیان نەزانێت.

### ١. قوتابخانەی بیناکاری یان دروستکاری

ئەو قوتابخانەیە لە ئەلمانیا سەری هەلّدا ونووسەران مێژووی دروست بوونی یەکەم تاقیگەی دەروونزانی لە سالّی ١٨٧٩ بە مێژووی لە دایك بوونی ئەو قوتابخانەیە دادەنێن. بەپێی بۆچوونی ئەو قوتابخانەیە، زانایان پێویستە لە دروست بوونی هەر ئەندامێك بکۆلّنەوە پێش ئەوەی بێنە سەر باسی فرمانەکانی ئەو ئەندامانە، هەر لەبەر ئەوش ئەو قوتابخانەیە ناوی دروستکاری لێنراوە.

لای ئەو قوتابخانەیە، دەروونزانی بریتیە لە زانستی نەست واتە (علم الشعور) کە پێویستە دەروونزانەکان لە پێکهێنەرەکانی بکۆلّنەوە وهەلّسن بە شیکردنەوەیان لە رێگای تێرامان. تێرامانیش بریتیە لە وەسف کردنی باری دەروونی وچۆنیەتی روودانی دیاردە دەروونییەکان وەك یادکردنەوە وبیرکردنەوە. هەندێك تێرامان بە شێوازی تێبینیکردنێکی زاتی دادەنێن واتە مرۆڤ بیر لە سۆز وعاتیفە وهزر وخەونەکانی خۆی دەکاتەوە[٣]. ئەوەی راستی بێت ئەو رێبازە رەخنەیەکی زۆری لێ گیراوە بە تایبەتی لەلایەن قوتابخانەی رەفتاریەتی وبە رێبازێکی نازانستی

[٣] بروانە: المعجم الموسوعي في علم النفس، نوربير سيلامي، ترجمة وجيه اسعد، منشورات وزارة الثقافة، دمشق،٢٠٠١، ج١، ص١٦٩.

حسێبی کرد. بەڵام ئەو رێبازە سوودێکی زۆری بە دەروونزانی گەیاند وەتا ئێستاش هەر بەکار دەهێنرێت[٤].

ولیەم ڤۆنت (١٨٣٢–١٩٢٠) کە زانایەکی فسیۆلۆژی ئەڵمانی بوو، بە دامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیە دادەنرێت. دەروونزانی، بە بۆچوونی ڤۆنت، پێویستە لە سەرەتادا بایەخ بە هەست (احساس) بدات وتوخمە پێکهێنەرەکانی شارەزایی نەست (الخبرة الشعورية) شیتەڵ بکات کە لە دوو لایەنی سەرەکی پێك دێت: هەستەکان ونەستەکان. جۆری یەکەم سەرچاوەکەی لە دەرەوەی مرۆڤە وەك هەستن کردنی مرۆڤ بە ئازار لە ئەنجامی سووتانی پێستیدا. بەڵام جۆری دووەم سەرچاوەکەی ژینگەی ناوەکی مرۆڤە وتایبەتە بە خۆی وبەبێ هۆیەکی دەرەکی روو دەدات، وەك یادکردنەوە. دەروونزانی ئینگلیزی تیچنەر (١٨٦٧–١٩٢٧)، کە قوتابییەکی ڤۆنت بوو، بیرو رای ئەو قوتابخانەی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بڵاوکردەوە وبە نوێنەری ئەو قوتابخانەیە دادەنرێت لەوێدا، بەڵکو هەندێك لە توێژەران بە دامەزرێنەری راستەقینەی ئەو قوتابخانەیە دایدەنێن[٥].

ئەوەی شایەنی باس بێت ئەو قوتابخانەیە بەشدارییەکی گرنگ و بەرچاوی هەبوو لە جودا بوونەوەی دەروونزانی لە فەلسەفە ونزیك بوونەوەی لە زانستە سروشتییەکان وەك فیزیا وکیمیا، کە دوو زانستی کاریگەر بوون وبەکارهێنانی شیکردنەوە لەو قوتابخانەیەدا بەرهەمی ئەو کاریگەرییە بوو. ئەوەی راستی بێت ئەو شێوازە لە رەخنەی قوتابخانەی گشتاڵت رزگاری نەبوو هەر وەك لەمەودوا تێبینی دەکەین.

## ٢. قوتابخانەی وەزیفی

ئەو قوتابخانەیە رابردوویەکی کۆن ومێژوویەکی نادیاری هەیە. لە ساڵی ١٨٩٨ تیچنەر ئەو ناوەی لەو قوتابخانەیە ناوە. بابەتی لێکۆلینەوەی ئەو قوتابخانەیە نەستە ودەروونزانی بەو شێوەیە زانستی نەستە و پێویستە بایەخ بە کردارە

---

[٤] لەکاتی باس کردنی رێبازەکانی دەروونزانی بەووردتر قسە لەسەر ئەو رێبازە دەکەین ولێرەدا بە پەلە بەسەریدا تێدەپەرین.

[٥] بڕوانە: موسوعة مدارس علم النفس، د. عبد المنعم الحفني، مكتبة مدبولي، بدون تاريخ، ص٨٢.

عەقلییەکان بدات نەك لە لایەن چۆنیەتی دروست بوونیان، هەر وەك قوتابخانەی دروستکاری جەختی لەسەر دەکات، بەڵکو لە لایەن فرمانیان یان رۆلیان لە بەدیهێنانی گونجاندن نێوان مرۆڤ ودەوروبەرەکەی بە هەردوو بەشییەوە: سروشتی وکۆمەلآیەتی. ئەو قوتابخانەیە وێڕای رێبازی تێڕامان، رێبازی تێبینی بێ لایەنیش پەیڕەو دەکرد.

بەناوبانگترین دەروونزانی ئەو قوتابخانەیە ولیەم جێیمس بوو کە دەورێکی کاریگەری هەبوو لە پێشخستنی ئەو قوتابخانەیە وبەپێزترین بەرهەمی جێیمس لەو بوارە کتێبی (بنەماکانی دەروونزانی) بوو کە لە سالی ١٨٩٠ بلآوی کردەوە. پەروەردەزان ودەروونزانی ئەمەریکی جۆن دووی (١٨٥٩–١٩٥٢) بەشداریەکی گرنگی کرد لە دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیە وبە هاوکاری جێیمس ئەنجیال یەکەم تاقیگەیان لە ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دروست کرد. ئەنیجال، لەلای خۆیەوە، بایەخێکی زۆری بە دەروونزانی ئاژەڵدا.

بیروڕاکانی ئەو قوتابخانەیە گەیشتە ولآتە ئەوروپیەکان وگرنگترین وبەناوبانگترین نوێنەری ئەو قوتابخانەیە لە ئەوروپا ئێدوارد کلاباربد (١٨٧٣–١٩٤٠) بوو کە تاقیگەیەکی دەروونزانی دامەزراند وئینستیتیوتی (ژان ژاك رۆسۆ) ی بۆ فێرکردنی مندالآن دروست کرد. دەتوانین چەند دەروونزانێکی تریش بە نوێنەری ئەو قوتابخانەیە بژمێرین وەك مۆلەر وکاتز ورۆبین.

لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی پراگماتیزم[٦]، کە ولیەم جێیمس خۆی یەکێك بوو لە دامەزرێنەرەکانی، دەروونزانەکانی ئەو قوتابخانەیە هەوڵیاندا کە ئەنجامی

---

[٦] پراگماتیزم زاراوەیەکی فەلسەفی یە لە لایەن فەیلەسوفی ئەمەریکی چارلز پێرس (١٨٣٩–١٩١٤) بە کار هات. خالی سەرەکی پراگماتیزم ئەوەیە کە هەموو شتێك بە ئەنجام وبەرهەم وکارتێکردنەکانی دەپێورێت. واتە بۆ دۆزینەوەی مانای هەر بیرۆکەیێك پێویستە لە ئەنجامە پراکتیکییەکانی ئەو بیرۆکەیە بکۆڵینەوە نەك لە سەرچاوە وچۆنیەتی. بەناو بانگترین نوێنەری ئەو فەلسەفەیە لە ئەمەریکا ولیەم جێیمس و جۆن دووی بوون ولە ئینگلتەرا فردیناند شیلر (١٨٦٤–١٩٣٨). بڕوانە: قصة الفلسفة، ول ديورانت، ترجمة: د. فتح الله محمد، بيروت: مكتبة المعارف، ط ٤، ١٩٨٢، ص٦١٦.

لێکۆڵینەوەکانیان لە بواری پەروەردە ویاسا وپیشە تاقی بکەنەوە. هەرچەندە ئەو قوتابخانەیە لە سەرەتای دروست بوونیدا دەورێکی گرنگی دیت لە بواری دەروونزانی، بەڵام لەم دواییەدا کز بۆوە و قوتابخانەیەکی تری جێگاکەی گرت.

### ٢. قوتابخانەی پەیوەستکاری

مێژووی ئەو قوتابخانەیە بۆ فەیلەسوفی یۆنانی ئەرستۆ تالیس دەگەڕێتەوە کە یەکەم بیردۆزی پەیوەستی لە بواری یاد کردنەوە دارشت[٧]. ئەو قوتابخانەیە لە سەردەمی رینەسانس بوژایەوە بە هۆی بەشداری چەند فەیلەسوفێکی ئینگلیزی وەك تۆماس هۆبز (١٥٨٨-١٦٧٩) وجۆن لوك (١٦٣٢-١٧٥٤) ودێڤید هیوم (١٧١١-١٧٧٦) ودێڤید هارتلی (١٧٠٥-١٧٥٧) وجێیمس میل و کوڕەکەی وئەلکسەندەر بین وچەندەها فەیلەسوفی دیکەش.

بەڕای دامەزرێنەرانی ئەو قوتابخانەیە، مرۆڤ کە لە دایك دەبێت عەقلی وەك تابلۆیەکی سپی وایە وهیچ نەخش ونیگارێکی لەسەر نەکێشراوە، پاشان لە رێگای ئەندامەکانی هەست زانیاری پەرت وبڵاو ونارێکمان بۆ دێت. پاش رێکخستن وبەیەکەوە بەستنەوەی ئەو زانیاریانە شارەزایی پەیدا دەبێت. ئەو رێکخستن وبەیەکەوەبەستنەوەیەش بە پێی سێ یاسا ئەنجام دەدرێت کە بریتین لە یاسای لەیەك چوون و یاسای دژیەك یاسای بەیەکەوە بوون.

ئەو قوتابخانەیە لە شێوەی تازە ونوێیدا، وهاوشان لەگەڵ تاقیکردنەوەکانی دەروونزانی ئەڵمانی هێرمان ئێبنگهاوس (١٨٥٠-١٩٠٩)، کەوتە کار. ئەزموون وتاقیکردنەوەکانی ئێبنگهاوس لە بواری یادکردنەوە بوو ولە ئەنجامدا گەیشتە چەند یاسایەك وەك دووبارە بوونەوە ونوێی. لە وڵاتە یەکگرتووەکان ئەمەریکاش ئێدوارد ثورندایك (١٨٧٤-١٩٢٩) نوێنەری ئەو قوتابخانەیە بوو وتاقیکردنەوەکانی

---

[٧] بڕوانە: موسوعة مدارس علم النفس، د. عبد المنعم الحفني، ص٤٦٥.

لە بواری فێركردن ئەنجامدا وبیردۆزی هەوڵ وهەڵەی پێشنیار كرد كە لە سەر بناغەی پەیوەستی نێوان ورپاكەروە[8] و وەڵامدانەوە[9] دامەزرابوو.

لە یەكێتی شورەوی (روسیا)، ئیڤان پیترۆفیچ پاڤلۆڤ (١٨٤٩–١٩٣٦) بە نوێنەری ئەو قوتابخانەیە دادەنرێت. هەرچەندە پاڤلۆڤ نەك هەر دەروونزان نەبوو بەڵكو پەیوەندیشی لەگەڵیان خۆش نەبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بیردۆزەكەی سەبارەت بە فێربوون لەسەر بناغەی پەیوەستی دامەزرابوو، ئەویش بە پەیوەستخواز لە قەڵەم درا. بە شێوەیەكی گشتی دەتوانین بلێین كە ئەندامی قوتابخانەی رەفتاری، كە ئێستا دێینە سەر باسیان، بە ئەندامانی ئەو قوتابخانەیەش دابنێین.

رێبازی لێكۆڵینەوە لای ئەو قوتابخانەیە بریتی بوو لە تێرامان وتاقیكردنەوە وئەزموون ولە دوو بواری گرنگ، كە فێربوون ویادكردنەوە بوو، خزمەتێكی بەرچاویان پێشكەش كرد.

### ٤. قوتابخانەی رەفتاركاری

ئەو قوتابخانەیە لەساڵی ١٩١٢ لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا لە لایەن جۆن واتسن (١٨٧٨–١٩٥٨) دامەزرا. واتسن لە پێناسە كردنی دەروونزانیدا دەڵێت: "زانستێكی سروشتییە دیراسەتی رەفتاری مرۆڤ دەكات لە خۆگونجاندی لەگەڵ دەوروبەرەكەی بە رێگای ئەزموون وبە مەبەستی دەست بەسەرداگرتنی".

واتسن لە پێناسەكەی پێشوویدا بابەتی نەستی (شعور) مرۆڤی فەرامۆش كردووە چونكە ناتوانێرێت بە شێوەیەكی راستەوخۆ تێبینی بكرێت وهەروەها ناكرێت تاقی بكرێتەوە. دەروونزانی، بە رای واتسن، بریتییە لە زانستی رەفتار (واتە سلوك) وبۆ ئەوەی رەفتاریش دیراسەت بكرێت پێویستە ورپاكەرەوە و وەڵامدانەوە دیراسەت

---

[8] ورپاكەرەوە (منبە) یان وروژێنەر (مثیر) بریتییە لە هەر گۆڕانێكی كیمیاوی یان فیزیاوی یان بایۆلۆژی لە ژینگەی دەرەوە یان ناوەوەی زیندەوەر كە كاری تێبكات وەك رووناكی ودەنگ وئازار وشتی دیكە.

[9] وەڵامدانەوە (الاستجابة) هەر كارێكە زیندەوەر دەیكات چ عەقلی بێت چ جەستەیی ولەوانە یە ببێتە ورپاكەروە بۆ خاوەنەكەی یان كەسانی دیكە وەك هەڵاتن وبیركردنەوە وكاری دیكە.

بکرێن وواز لە شێوازی تێرامان بهێنرێت چونکە ئەو شێوازە تەگەرەیەکە لە بەردەم گەشەکردنی دەروونزانی.

ئەو قوتابخانەیە لە سەرەتای دروست بوونیدا سوودێکی زۆری لە دۆزینەوەکانی بەختریف وپاڤلۆڤ وەرگرت سەبارەت بە دیاردەی پێچەوانبوونەوەی مەرجدار "الانعكاس الشرطي" وە لە بواری لێکۆڵینەوەکانی مێشك وفرمانەکانی ناوچە جۆراوجۆرەکانی، کارەکانی لاشلی وفرانز کەلکێکی زۆری بۆ ئەو قوتابخانەیە هەبوو.

شان بەشانی واتسن، چەند دەروونزانێکی تر بەشداریان کرد لە پێشخستنی رەورەوەی ئەو قوتابخانەیە بەناوبانگترینیان بریتین لە تۆلمان (١٨٨٦-١٩٥٩) وکلارك هۆل (١٨٨٤-١٩٥٢) وبارۆس سکینەر (١٩٠٤-١٩٩٠؟). سکینەر بە نوێنەری قوتابخانەی نوێی رەفتارکاری دادەنرێت وکارەکانی لە بواری فێربوون گەلێك بەهادار بوون. فێربوون، بە رای سکینەر، بناغەی رەفتارە وبۆماوە (واتە وراثة) هیچ دەورێکی نییە لەو بوارە ونەخۆشییە دەروونییەکانیش تەنیا بریتین لە فێربوونی چەند خوویەکی خراپ.

لەوانەیە گرنگترین رەخنە کە لەو قوتابخانەیە گیراوە مەسەلەی رەچاونەکردنی باری ناوەوەی مرۆڤە وەك بیرکردنەوە وهەست ونەست. بۆیە هەندێك لە دەروونزانەکانی ئەو قوتابخانەیە لەم دواییەدا گرنگیان بەلایەنی فیکری دا ناودارترینان "ئەلبێرت بەندۆرا" یە. بەهەر حال ئەو دەورەی کە ئەو قوتابخانەیە بینی لە پێشخستنی دەروونزانی ناکرێت پشت گوێ بخرێت بە تایبەتی لە بواری فێربوون .

## ٥. قوتابخانەی گیشتالت[١٠]

لەو کاتەی کە قوتابخانەی رەفتارکاری لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە گەشەسەندندا بوو، بزووتنەوەیەکی دەروونزانی لە ئەلمانیا سەری هەلدا وهێرشێکی توونذ وتیژی کردە سەر گشت قوتابخانەکانی دەروونزانی چونکە هەلستاون بە شیکردنەوەی رەفتار بۆ چەند بەش وپارچەیەك ووەك یەکەیەك مامەلەیان لەگەلدا نەکردووە.

ماکس فێرتهێیمەر (١٨٨٠-١٩٤٣) پێشەوای ئەو بزووتنەوەیە بوو ولێکۆلینەوەکانی بە بابەتی زانین دەست پیێ کرد وگەیشتە ئەو ئەنجامەی کە پرۆسەی زانینی شت (واتە ادراك) بە شێوەی یەکەیەکی گشتی دەست پیێ دەکات و(گشت) یش جیاوازی هەیە لەگەلّ توخمە پێکهێنەرەکانی، واتە بەشەکانی، ومێشکی مرۆڤیش هەولّی ئەوە دەدات کە ئەو زانیاریە هەستییانەی کە بۆی دێت لە شێوەی گشت بن واتە تەواو بن. ولە کاتی ناتەواوی ئەو زانیاریانە، مێشك هەلدەستێت بە رێکخستنیان یان رێکخستنی بواری فێربوون ولە ئەنجامدا فێربوون بەرهەم دێت.

ڤۆلفگانگ کۆهلەر وکورت کۆفکا (١٨٨٦-١٩٤١) دوو دەروونزانی ئەلمانی بوون ولێکۆلینەوەکانیان وتاقیکردنەوەکانیان سەبارەت بە فێربوون بناغەی ئەو قوتابخانەی دانا. سەبارەت بە بابەتی کەسایەتی ورەفتار، دەروونزانی ئەلمانی کورت لیڤین (١٨٩٠-١٩٤٧) بیردۆزی بوار (المجال) ی هێنا کایەوە وچەند رێگایەکی ماتماتیکی وەك شیکردنەوەی هۆکارەکان، ورێگای تێرامان وتێبینی وتاقیکردنەوەی بەکار هێنا لە لێکۆلینەوەکانی.

هەرچەندە ئەو قوتابخانەیە هەلسا بە دیراسەکردنی ژمارەیەکی زۆری لە بابەتەکانی دەروونزانی، بەلام بەشداریەکی گرنگی هەبوو لە پێشخستنی دەروونزانی لە بواری زانین وفێربووندا.

---

[١٠] گیشتالت Gestalt ووشەیەکی ئەلمانی یە مانای شێوە یان جۆر دەدات ومەبەست لیی ئەو گشتە تەواوەیە کە ناتوانرێت شی بکرێتەوە. ئەو ووشەیە دروشمی ئەو قوتابخانەیە بوو لە سەرەتای دروست بوونیدا.

### ٦. قوتابخانەی شیكردنەوەی دەروونی

ئەو قوتابخانەیە لە ئەمسا سەری هەڵداساڵی ١٩٠٠ وبابەتی سەرەكی نەخۆشیە دەروونییەكان بوو، واتە بواری پزیشكی وبواری زانستی نەخۆشیەكانی دەروون. دەروونزانی ئەمساوی سیگمۆند فرۆید (١٨٥٦-١٩٣٩) بە دامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیە دادەنرێت كە لە ئەنجامی لێكۆڵینەوەكانی لەسەر ئەو دەروون نەخۆشانەی كە چارەسەری دەكردن، چەند بیردۆزێكی هێنا كایەوە كە لە ڕاستیدا شۆرشێكی بەرپا كرد نەك تەنها لە بواری دەروونزانی بەڵكو لە بواری تریش وەك كۆمەڵناسی وئەدەب وهونەر.

بە ڕای فرۆید كەسایەتی لە سێ بەش پێك دێت: خۆیەكی وخۆمەكی وخۆمەكی باڵآ. ئینجا ئەگەر مرۆڤ توانی هەر سێ لا ڕازی بكات ونەهێڵێت بەربەرەكانی نێوانیان بەردەوام بێت وبەرەبستێنێت ولەهەمان كاتیشدا توانی لەگەڵ واقیعدا بیانگونجێنێت، ئەوا كەسایەتیەكەی ساغ وسەركەوتوو دەبێت بەڵام ئەگەر ئەو مرۆڤە، لەبەر هەر هۆیەك بێت، نەیتوانی ئەو كارانە ئەنجام بدات وئەو هاوسەنگییە بێنێتەدی ئەوا كەسایەتیەكەی تێك دەچێت وتووشی جۆرەها نەخۆشی دەروونی دێت.

فرۆید چەند چەمكێكی تازەی هێنا ناو دەروونزانی وەك چەمكی نائەست "اللاشعور" وپێش ئەست "قبل الشعور" وبایەخێكی زۆری بە لایەنی جنسی دا بە تایبەتی لە قۆناغی منداڵیدا. بە بۆچوونی فرۆید، كپ كردنی ئەو ئارەزووانەی كە لە ئاستی نائەستدا هەن هۆی سەرەكی پەیدا بوونی گرێ دەروونیەكانە. نامەوێ لێرەدا زیاتر بچمە ناو قوڵایی ئەو بابەتە چونكە ئەو هەویرە ئاوێكی زۆری دەوێ وخوێنەر دەتوانێت زیاتر دەربارەی ئەو بابەتە بزانێت لە كتێبی "نەخۆشییە دەروونیەكان" و"كەسایەتی سەركەوتوو" ی مامۆستا جلال خلف ژالەیی. سەبارەت بە رەخنە گرتن لە بیرو بۆچوونەكانی فرۆید، كتێبی "فرۆید لە تەرازووی ژێریدا" ی مامۆستا محمد شارەزووری خوالێخۆشبوو سەرچاوەیەكی باشە بۆ ئەو مەبەستە.

ئەوی ڕاستی بێت فرۆید کۆمەڵە دەروونزانێکی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە وبەناوبانگترینیان کارل یۆنگ (١٨٧٥-١٩٦١) وئەلفرید ئادلەر (١٨٧٠-١٩٣٧) و(ئێریك فرۆم) و(کارین هۆرنی) و(هاری ستاك سۆلیڤان) و(ئێریك ئێریکسۆن) بوون کە لە ڕاستیدا گۆرانێکی زۆریان بەسەر بیردۆزەکانی فرۆید دا هێنا وبەتایبەتی یۆنگ وئادلەر کە هەردووکیان دوو قوتابخانەی سەربەخۆیان دامەزراند وزیاتر بایەخیان دا بەلایەنی کۆمەڵایەتی ولایەنی تاکە کەسی ولە بەهای پاڵدەری جنسیان کەم کردەوە[11]. لە چارەسەرکردنی نەخۆشیە دەروونییەکان، فرۆید چەند ڕێگای جیاوازی بەکار هێنا وەك نواندی موگناتیسی، کە لە دواییدا وازی لێهێنا، وشیکردنەوەی خەون و پەیوەستی سەربەخۆ و دیراسەت کردنی رابردووی، قۆناغی منداڵی، بابای نەخۆش.

ئەوی ڕاستی بێت ئەو قوتابخانەیە کاریگەریەکی زۆری هەبوو بە تایبەتی لە بواری هونەر ئەدەب وکۆمەلناسی وئایین وئێستاش چەمکەکان و شێوازی چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان لە چەند جێگایەکی وەك فەرەنسا وئەلمانیا ونەمسا پەیرەو دەکرێن. بەلاّم ئەو قوتابخانەیە زیاتر لە هەر قوتابخانەیەکی تری دەروونزانی ڕەخنەی لێگیراوە نەك تەنها لەلایەن دەروونزانەکان بەڵکو لەلایەن کۆمەلناس و ئەدیبان و زانایانی ئایینیش.

ئەو شەش قوتابخانانەی دەروونزانی کە بە کورتی باسم کردن دەروونزانی نوێیان پێك هێناوە. بەلاّم جێگای ئاماژە پێ کردنە کە بزووتنەوەی تریش سەریان هەڵدا وبەشداریان کرد لە دروست کردنی دەروونزانی هاوچەرخ بەلاّم ئەو گرنگییەیان

---

[11] یۆنگ لە ساڵی ١٩١١ لە فرۆید دوورکەوتەوە وقوتابخانەیەکی سەربەخۆی دامەزراند ناوی نا دەروونزانی شیکار وناهەستی کردە دوو جۆر: تاك و کۆمەل، وکەسایەتیشی دابەش کرد بۆ دوو جۆر: گۆشەگیر وکراوە وهەر جۆرێکیشی بۆ چوار جۆری تر دابەش کرد. بەلاّم ئادلەر لە ساڵی ١٩١٢ وازی لە فرۆید هێنا وقوتابخانەیەکی سەربەخۆی بەناوی دەروونزانی تاك دامەزراند وبایەخێکی گرنگی دا بە هەست کردنی بە کەمی. ئەوەی ڕاستی بێت ئەو دوو قوتابخانەیە هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆیان نەبوو لەگەڵ قوتابخانەی شی کردنەوەی دەروونی لەلایەن ڕێبازی لێکۆلینەوەیان.

نەبوو ئەگەر بەو شەش قوتابخانەیە بەراورد بکرێن، بۆ نمونە ئەو بزووتنەوەی کە ولیەم مکدۆگال (١٨٧١–١٩٣٨) پێشەوای کرد کە ڕای وابوو ڕەمەك بناغەی ڕەفتارە وچوار جۆری لە ڕەمەکەکان دیاریکرد وهەر ڕەمەکێکیش تاوگیریەکی (واتە انفعال) تایبەتی خۆی هەیە ولە ڕێگای بۆماوەوە پێمان دەگات وئامانجی خۆی هەیە. مکدۆگال تێبینی کردن وتێرامان وئەزموونی بەکار هێنا وەك شێوازی لێکۆلینەوە. ئەو ڕاستی بێت چەند بزووتنەوەیەکی تریش پاش جەنگی جیهانی دووەم پەیدا بوون کە ڕەخنەیان لە قوتابخانە دەروونزانییەکان گرت وەك بزووتنەوەی زانست خوازەکان، کە ڕەخنەیان لە قوتابخانەی ڕەفتارکاری گرت، وبزووتنەوەی مرۆڤخوازەکان کە مرۆڤ وگیروگرفتەکانی ولایەنەکانی ژیانی بەگشتی کردە چەقی لێکۆلینەوەیان وبەناوبانگترینیان ئەبراهام ماسلۆ وکارل ڕۆجەرز بوو کە بایەخێکی تایبەتیان بە بابەتی هێنانەدی خود (واتە تحقيق الذات) دا.

ئەو کورتە باسە ئەگەر تێنویەتی خوێنەر بەشێوەیەکی گشتی بشکێنێت ئەوا خوێنەری پسپۆر تێرناکات بەلاّم مەودای ئەو باسە هەر ئەوەندە دەبێت لەو کتێبە گشتییە. دیارە کتێبی تایبەتی، چ بە زمانی عەرەبی وچ بە زمانی ئینگلیزی، لەو بوارە دا زۆرن ولەبەر دەستن ئەگەر کەسێك بیەوێت لەدوایاندا بگەڕێت.

## خۆت تاقی بکەوە !

١. لای قوتابخانەی بیناکاری، گرنگترین بابەت لە دەروونزانی چییە؟ وبەچ شێوازێکی دەتوانرێت لەو بابەتە بکۆڵرێتەوە؟

٢. گرنگترین جیاوازی لە نێوان قوتابخانە بیناکاری و قوتابخانەی وەزیفی لە بواری دەروونزانیدا چییە ؟

٣. ئەو رەخنانە چین کە لە قوتابخانەی رەفتارکاری گیران؟

٤. بۆچی دامەزرێنەرانی قوتابخانەی گیشتالت رەخنەیان لە بۆچوونەکانی قوتابخانەی بیناکاری گرت؟

٥. ئەو چەمکە گرنگانە چی بوون کە فرۆید زۆر بایەخی پێدان لە قوتابخانەی شیکاری دەروونی؟

# لقەکانی دەروونزانی

لەو کاتەی کە دەروونزانی گۆڕانی شاقولی بە خۆیەوە دەدی، لەسەر ئاستی ئاسۆییش گۆڕان روویدا. واتە چۆن دەروونزانی لە لایەنی قوتابخانەکانی گەشەی کرد ئەوهاش گەشەکردن لقەکانی ئەو زانستەی گرتەوە. ئەوەش ئەنجامێکی ئاسایی زۆربوونی لێکۆلینەوەیە لە هەر زانستێکدا.

بە شێوەیەکی گشتی لقەکانی دەروونزانی بۆ دوو چەشن دابەش دەکرێن: لقە تیۆریەکان ولقە پراکتیکی یەکان. بەڵام مەبەست لەو دابەش کردنە ئەوە نییە کە هەر لقێك سەربەخۆیە وپەیوەندی بە لقی تردا نییە بەڵکو مەبەست دیاریکردنی بواری لێکۆلینەوە وتاقیکردنەوە وپسپۆریە. جا بۆیە شتێکی سەیر نییە ئەگەر تێبینی پەیوەندیەکی توند بکەین نێوان ئەو دوو لقە. ئەوەی ڕاستی بێت هەر لقێك لەم دوو لقە چەند لقێکی وردتر دەگرێتە خۆی ولەمەودوا بە کورتی دێینە سەر باسیان.

**یەکەم: لقە تیۆریەکان:**

بریتین لەو لقانەی کە زیاتر خەریکی بیردۆز دانانن، هەر وەك لە ناوەکەیدا دیارە. وە گرنگترین لقە تیۆریەکانی دەروونزانی ئەمانەی خوارەوەن:

١. **دەروونزانی گشتی:** ئەو لقە بایەخ بە گشت چالاکییە دەروونییەکانی مرۆڤ دەدات وەك بیرکردنەوە ویاد کردنەوە وتاوگێری (انفعال) وکەسایەتی وگشت بابەتەکانی تری دەروونزانی بە مەبەستی گەیشتن بە بنەما ویاسا گشتییەکانی ڕەفتاری مرۆڤی ئاسایی بە بێ ڕەچاوی کردنی جیاوازی نێوان تاکەکان وحاڵەتە تایبەتیەکان[1]. ئەو لقە بناغەی لقەکانی ترە واتە هەر لقێك لە لقەکانی دەروونزانی دەبێت بەو لقە دەست پێ بکات وپاشان بەرەو لقە تایبەتییەکەی خۆی بچێت. یاخود دەتوانێرێت بگوترێت کە ئەو لقە یەکەم ئەلقەیە لە زنجیرەی لقەکانی

---

[1] بڕوانە: أسس علم النفس العام، د. طلعت منصور، د. أنور الشرقاوي، د. عادل عزالدين، د. فاروق أبو عوف (بدون تاريخ وسنة النشر) لاپەڕە ١٧.

دەروونزانی کە هەموویان سوودی لیّ وەردەگرن. لەو لقە چەمك وزاراوە دەروونییەکان پێناسە دەکرێن وبە کورتی وچڕوپڕی بیردۆزەکانی دەروونزانی دەربارەی بابەتە دەروونییەکان ڕوون دەکرێنەوە وگرنگترین ئەنجامی ئەزموونە دەروونییەکان، کە لە بوارە تیۆریە جۆراو جۆرەکان ئەنجام دراون، دەخرێنە پێش چاو.

٢. **دەروونزانی جوداخوازی:** لە ژیانماندا تێبینی جیاوازیەکی زۆر لە نێوان خەڵك دەکەین کە ئەوەش دەبێتە هۆی جیاوازی کەس وکۆمەڵ وگەل ومیللەتان. دیارە هەندێك لەو جیاوازیانە ئەنجامی فەلسەفەی کۆمەلایەتی وشێوازی پەروەردەن وهەندێکی تریان بەرهەمی بۆماوەن. ئەو جیاوازیەش زۆربەی لایەنەکانی دەروونی دەگرێتەوە وەك زیرەکی وکەسایەتی وبیرکردنەوە وهتد.. دەروونزانی جوداخوازی ئەرکی لێکۆڵینەوەی ئەو جیاوازیانەی خستۆتە سەر ئەستۆی خۆی ئەوەش بە پشت بەستن بە دەروونزانی گشتی لە لایەك وبە کۆمەڵناسی لە لایەکی ترەوە.

٣. **دەروونزانی گەشە کردن:** بابەتی ئەو لقە گەشە کردنی دەروونی مرۆڤە وبۆ ئەو هێنانەدی ئەو مەبەستە ئەو لقە هەڵدەستێت بە دیراسەت کردنی مرۆڤ لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا، بە قۆناغی پیترانی هێلکە دەست پیّ دەکات لەسکی دایك وبە مردن کۆتایی دێت. وە لە نێوان ئەو دوو قۆناغە سەرەتایی وکۆتاییەدا چەند قۆناغێکی تر هەن وەکو منداڵی وهەرزەکاری و گەنجیەتی، کە هەر یەکیان بوارێکی تایبەتی لێکۆلینەوەن[٢]. بۆ نمونە دەروونزانی مندال دیراسەتی گەشە کردنی جەستە وجوڵە وژیری وزمان وئینفعال ولایەنە کۆمەلآیەتیەکانی منداڵ دەکات ودەروونزانی هەرزەکاری دیراسەتی لایەنی جەستەیی وژیری وچۆنیەتی گونجان لەگەڵ کەسانی تر وگیروگرفتەکانی ئەو قۆناغە وچەندەها لایەنی تر دەکات. ئەو لقە بایەخێکی باش بە لایەنی بایۆلۆجی لەش وگلاندەکان وکۆئەندامی دەمار دەدات بە تایبەتی لە قۆناغی منداڵی وهەرزەکارییدا. ئینجا سەیر نییە ئەگەر ئەو لقە پەیوەندی یەکی بەهێزی لەگەڵ بایۆلۆجیا وپەروەردەدا هەبێت.

---

[٢] **بروانە:** سايكولوجية الطفل: علم نفس النمو، د. حابس العوالمة ود. أيمن مزاهرة (عمان: الأهلية للنشر والتوزيع، ٢٠٠٣)، **لاپەڕە ١٤ و١٥.**

٤. **دەروونزانی کۆمەڵایەتی:** ئاشکرایە کە مرۆڤ ناتوانێت بە تەنیا ودوور لە کۆمەڵدا ژیان بەسەر ببات. ئەو ڕاستییە زەمینەی فەلسەفی ئەو لقەیە کە هەوڵ دەدات دیراستی ڕەفتاری مرۆڤ بکات لە چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی، واتە تاکە کەس چۆن کار لە کۆمەڵ دەکات وکۆمەڵیش چۆن کار لە تاکەکەس دەکات، وە هەروەها دیراسەتکردنی ئەو پەیوەندییانەی کە تاکەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە لە مەوقیفە کۆمەڵایەتیەکان. کۆمەڵناسی، کە دیراسەتێکی زانستیانەی کۆمەڵە وبایەخ بە گیروگرفتەکان ودیاردە کۆمەڵایەتیەکان دەدات، پەیوەندییەکی توندی بەو لقە هەیە ویارمەتی یەکتری دەدەن وئەنجامی لێکۆڵینەوەکانیان ئالوگۆڕ دەکەن. شایەنی باسە ئەو لقە بەشداری دەروونزانی سەربازی دەکات لە چەند بابەتێکەوە وەك سەرکردایەتی وپروپاگەندە وچەند بابەتێکی تریش.

٥. **دەروونزانی نائاساییەکان:** بابەتی لێکۆلینەوەی ئەو لقە کەسە نائاساییەکانە. مەبەست لە نائاساییەکان ئەو کەسانەن کە لە ڕەفتار وبیرکردنەوە جیاوازیان هەیە لەگەڵ خەڵك وئەندامانی کۆمەڵەکەیان. بە پێی ئەو پێناسەیە گشت دەرووننەخۆش وعەقل ناتەواو ودواکەوتووەکان بە نائاسایی دادەنرێن. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت هەندێك جار کەسانی بلیمەت وزۆر لێهاتووش بە ڕێزپەڕ (شاذ) لە قەلەم دەدرێن، دیارە ئەو جۆرە نائاساییە ئیجابی وچاکە بە پێچەوانەی ئەو کەسانەی کە پێچەوانەی ئەوانن. ئەو لقە بایەخ بەو جۆرە کەسانە دەدات لە لایەن پۆلێن کردنیان ودیاریکردنی هۆی نائاساییان وچۆنیەتی چارەسەرکردن ومامەڵە لەگەڵ کردنیان. ئەو لقە، بە حوکمی بوارەکەی، پەیوەندیەکی بەهێزی بە دەروونزانی کلینیکی وپزیشکی هەیە.

٦. **دەروونزانی ئاژەڵ:** دەروونزانی ئاژەڵ بریتییە لە "دیراسەت کردنی ڕەفتاری جۆرە جیاجیاکانی گیانەوەرەکان بە مەبەستی بەراورد کردن لە نێوانیاندا لەسەر ئاستی زیرەکی ومەسەلەی کۆمەڵایەتی"[٣]. مرۆڤی ئاسایی کە تێبینی ڕەفتاری ئاژەلان دەکات چەند پرسیارێکی لا دروست دەبێت سەبارەت بە دەروونی ئاژەڵ وگەشەکردنی وچەندەها بابەتی تریش لەو بوارە کە گشت ئاژەڵەکان دەگرێتەوە

[٣] قامووسی دەروون ناسی، د. عبد الستار طاهر شريف، لاپەرە ٢٥.

وبەتایبەتیش مشك وپشیلە ومریشك وسەگ ومەیمون. ئەو لقە سوودێکی زۆری لە ئاژەڵزانی وزانستی فرمانی ئەندامەكان (فسیۆلۆجیا) وەرگرتووە بە تایبەتی لە بواری دروست بوون وگەشەكردن وچۆنیەتی كاركردنی وفرمانی ناوچە تایبەتییەكانی مێشكی ئاژەڵ. بۆیە سەیر نییە كە ئەنجامی ئەزموونەكانی پاڤلۆڤ، كە پسپۆر بوو لە بواری زانستی فرمانی ئەندامەكان، لەسەر سەگ زەمینە بۆ سەرهەڵدانی بیردۆزێكی گرنگ لە بواری فێربوون خۆش بكات!

٧. **دەروونزانی بەراوردكار:** ئەركی سەرەكی ئەو لقە بەراورد كردنە، هەروەك لە ناوەكەیدا دیارە. بەراورد كردن لە نێوان مرۆڤ وئاژەڵ لەلایەن رەفتاریاندا، لە نێوان مرۆڤی دەروون ساغ و مرۆڤی دەروون نەخۆش، لە نێوان مرۆڤی زیرەك ومرۆڤی دەبەنگ، لە نێوان رەفتاری پیر ومنداڵ، وژن وپیاو وهتد.. بۆ جێ بەجێ كردنی ئەركەكەی، ئەو لقە پشت بە لقەكانی دیكەی دەروونزانی دەبەستێت بە تایبەتی دەروونزانی گەشەكردن ودەروونزانی ئاژەڵ ودەروونزانی نائاسایی یەكان.

**دووەم: لقە پراكتیكی یەكان:**

ئەو زانیاریە دەروونییانەی كە لە لقە تیۆریەكان دەستمان دەكەوێت لە خودی خۆیان هیچ سوودێكی پراكتیكی وواقعییان نییە. لەبەر ئەوە سەرهەڵدانی چەند لقێكی تری دەروونزانی، كە ئەركی جێ بەجێ كردنی ئەو زانیاریانەیە لە بوارە جۆربەجۆرەكانی ژیان بخاتە ئەستۆی خۆی، بووە ئەنجامێكی حەتمی. ئێستاش بە كورتی باسی چەند لقێكی پراكتیكی دەروونزانی دەكەین:

١. **دەروونزانی پەروەردەیی:** بابەتی لێكۆلینەوەی ئەو لقە گشت ئەو مەسەلەیانەیە كە پەیوەندییان بە دیاردەی پەروەردە وفێربوون هەیە وەك گەشە كردن، جەستەیی وعەقلی وئینفیعالی، وقۆناغەكانی وچۆنیەتی بەرێوەچوونی پرۆسەی فێربوون وئەو بارو دۆخانەی كە ئەو پرۆسەیە ئاسان وسەركەوتوو دەكەن، چ پەیوەندیان بە مرۆڤ هەبێت وەك مامۆستا وقوتابیان وكەسایەتییان، تەمەنیان، رەگەزیان، توانا وئامادەبوونیان وهتد، چ پەیوەندیان بە لایەنی ماددی وسروشتی هەبێت وەك رووبەری قوتابخانە وپۆل وئاستی رووناكی تیایدا وبوونی

هۆیەكانی فێركردن وشتی دیكەش. كەواتە دەتوانین بابەتەكانی لێكۆلینەوەی ئەو لقە بە چوار ووشە كورت بكەینەوە كە بریتین لە تەوەرە سەرەكییەكانی: فێربوون، مامۆستا، قوتابی وقوتابخانە. هەندێك لە توێژەرەكان بواری دەروونزانی پەروەردەیی فرەوانتر دەكەن وبابەتی فێربوون بە بابەتی سەركی تیایدا حسێب ناكەن بەڵكو جەخت لەسەر لایەنی گەشە كردن دەكەن بۆ نمونە أبو جادو پێناسەی دەروونزانی پەروەردەیی دەكات بەو شێوەی خوارەوە: "بریتییە لە دیراسەكردنێكی رێك وپێكی رەفتار وكردارە عەقلی ونەستییەكانی مرۆڤ ولایەنە جەستەییە پەیوەندیدارەكان، لە بوارە پەروەردەییەكان كە ئامانجی یارمەتی دانی تاكە بۆ ئەوەی بە شێوەیەكی تەواو گەشە بكات لە لایەنی عەقلی وجەستەیی ونینفیعالی و كۆمەلایەتی بۆ ئەوەی بتوانێت خۆی هەم لەگەڵ خودی خۆی وهەم لەگەڵ دەورووبەرەكەشی بگونجێنێت"[٤].

٢. **دەروونزانی پیشەسازی:** بێ گومان مرۆڤ چەقی پرۆسەی پیشەسازیە، بۆیە ئەو لقە بایەخێكی زۆر بەو لایەنە دەدات وهەڵدەستێت بە شیكردنەوەی پیشە وكارەكان وئەو توانا وسیفەتانەی كە پێویستن هەبن بۆ ئەوەی پیشەكە بە باشی ئەنجام بدرێت، ئەوەش شیكردنەوەی كەسایەتی كرێكار دەگرێتەوە لە هەموو لایەنەكانیەوە بە مەبەستی هەڵبژاردنی شیاوترین وباشترین كەس بۆ ئەو كارەی كە دەتوانێت بە باشی پێیان هەڵبستێت. وێرای ئەوەش، ئەو لقە هەڵدەستێت بە دیراسەتكردنی دیاردەی ماندوبوون وبێزاربوون وهۆیەكانی كەم بوونەوەی بەرهەم هێنان وچاك كردنی لایەنی چەندی وچۆنی وچارەسەركردنی گیروگرفتی كرێكاران، چ كەسی بن یان پەیوەندیان بە كار وپیشەكە هەبێت. گرنگی دەروونزانی پیشەسازی لە سەرەتای سەدەی رابردوو ئاشكرا بوو وخاوەن كارگەكان بایەخێكی باشیان پێدا وبەناوبانگترین كەس لە سەرەتای بزووتنەوەی دەروونزانی پیشەسازی فریدریك تایلۆر بوو كە بیردۆزی جولآنەوە وكاتی پێشنیار كرد.

---

[٤] بروانه: علم النفس التربوي، د. صالح محمد علي أبو جادو (عمان: دار المسيرة، ط٤، ٢٠٠٥) ص:٢٦.

٣. **دەروونزانی بازرگانی:** بێ گومان کرداری کڕین وفرۆشتن پەیوەندی بە لایەنی دەروونی مرۆڤەوە هەیە، بە تایبەتی کڕین وفرۆشتنی کەل وپەلە ناسەرەکییەکان، وەیان چۆنیەتی هەڵسوکەوت نێوان کڕیار وفرۆشیار بە باشترین شێوە بە مەبەستی سەرنج راکێشانی بابای کڕیار بۆ ئەوەی کەل وپەلێکی دیاریکراو بکڕێت. بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستە، چەندەها رێگا وستراتیجی راستەوخۆ ولاوەکی هێنرانە کایەوە کە بەشێك لە سایکۆلۆجیای رێکلام پێك دێنن. زانینی هەڵوێستی خەڵك بەرامبەر کەل وپەل قۆناغێکی سەرەتایی وگرنگە لە کرداری فرۆشتن. ئەو مەسەلەیەش پەیوەندی بە لایەنی بایۆلۆجی وسایکۆلۆجیەوە هەیە. لەبەر چی کەل وپەل لە بازرگانێك دەکڕین نەوەك لە بازرگانەکەی دراوسێی، هەرچەندە نرخی کەل وپەلەکە لای هەردووکیان یەکسانە؟ بێ گومان زۆر هۆ هەن وەك هەڵوێستی بابای بازرگان وچۆنیەتی رێکخستن وپێشکەش کردنی کەل وپەلەکانی ورازاندنەوەی دوکانەکە بە شێوەیەکی سەرنج راکێشەر وچەندەها هۆی تریش. ئەو لقە ئەلقەیەکە بواری ئابووری، بە تایبەتی کڕین وفرۆشتنی شتە بەرهەم هێنراوەکان یان خزمەتگوزاریەکان، بە بواری دەروونزانی دەبستێتەوە. لەبەر ئەوە ئەو لقە سوود لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی دەروونزانی گشتی ودەروونزانی کۆمەڵایەتی وەردەگرێت لە پێکهێنانی بۆچوون وبیردۆزەکانی.

٤. **دەروونزانی تاوانکاری:** تاوان هەر کارێکە کە یاسا قەدەغەی کردبێت وسزای ئەو کەسە بدات کە بیکات. تاوانبارەکانیش بە پێی کەسایەتییان دەکرێن بە دوو بەش: تاوانباری دەروون دروست وتاوانباری دەروون نەخۆش[°]. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بلێین هەر تاوانێك چەند هۆیەکی سایکۆلۆجی وکۆمەلایەتی هەیە ودیراسەت کردنی ئەو هۆیانە، وبەتایبەتی هۆیە دەروونی وژیرییەکان، وشیکردنەوەی کەسایەتی بابای تاوانبار وبەکارهێنانی رێبازی چاککردنەوەی منداڵ وهەرزەکارە لادەرەکان، رۆشنایی دەخاتە سەر تاوانەکە ویارمەتی هێنانەدی دادپەروەری یاسایی دەدات. لقی دەروونزانی تاوانکاری ئەو ئەرکانەی کە لە

---

[°] الجريمة: الجوانب النفسية والعقلية للجريمة، د. يَالح شيخ كمر، بغداد: دار الشؤون الثقافية، ١٩٨٩.

سەرەوە باس کران دەخاتە ئەستۆی خۆی وهەوڵ دەدات جێ بەجێیان بکات ولەو ڕووەوە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە زانستی پزیشکی دەروونی دادوەری ویاسا وتاوانزانی هەیە ولەگەڵ هەر یەك لەو زانستانە سوود وزانیاری ئالوگۆر دەكات. ئەوەی شایستەی باس کردنە وەنەبێ ئەو لقە فرمانی پاك کردنەوەی گۆڕەپانی تاوانباران ولابردنی لێپرسینەوەی یاسایی لەسەریان وسزا نەدانیان بێت، تەنیا لە هەندێك بارودروف تایبەتی نەبێت وەك تووشبوون بە نەخۆشی دەروونی ونزمی ئاستی ژیری كە دەبنە هۆی سووك کردنی سزا ویان لابردنی، بەڵام لە حالەتی ئاسایی داوای سووك كردن یان لابردنی سزا ناكات بەڵكو سوور دەبێت لەسەر جێ بەجێ کردنی.

٥. دەروونزانی دادگایی: ئەو لقە درێژبوونەوەی لقەکەی پێشترە چونکە تاوان پاش سەلماندنی، پێش کەش بە دادگا دەکرێت بۆ دیراسەت کردنی وسزادانی تاوانبار پاش گوێ گرتن لەو کەسانەی کە ڕووداوەکە یان تاوانەکەیان بینیوە ولەو پارێزەرەی کە هەوڵ دەدات بەڵگەی پێچەوانە پێشکەش بکات بە مەبەستی بەدیار خستنی بێ تاوانی کابرای تاوان پێ هەڵواسراو وەیان سووك کردنی ئەو حوکمەی لەسەری دەردەچێت پاش سەلماندنی تاوانەکە لەسەر کابرا. لێرەدا ڕۆڵی ئەو لقە دیراسەت کردنی لایەنەکانی کرداری بەدادگا کردن دەبێت کە بریتین لە قازی وشاهیدەکان وپارێزەر وتاوانبار وئەو کەسانەی کە پەیوەندیان بە کرداری حوکمدان لەسەر تاوانباران هەیە. دیراسەت کردنی ئەو بارو زروفەی کە شوێنەواری خۆیان لەسەر بابای قازی ولەسەر ئەو حوکمەی کە دەیدات بەجێ دەهێڵن، بۆ نمونە کاری تاوگیری (الانفعال) لەسەر قازی کە هەندێك پارێزەر سوودی لێ وەردەگرن بۆ سووك کردنی حوکمەکە وچەندەها مەسەلەی تریش کە پەیوەندیان بەو کردارە هەیە ومەبەست لەو دیراسەتە هێنانەدی دادپەروەرییە لە ڕووی یاسایی وسایکۆلۆجی وستەم نەکردنە لە هیچ کەس لەو بوارەدا.

٦. دەروونزانی سەربازی: ئەو لقە دیراسەتی کەرتێکی تایبەتی دەکات لە کۆمەڵگا کە ئەویش سەربازن. ئەو دیراسەتەش چەند لایەنێك دەگرێتەوە وەك چۆنیەتی هەڵبژاردنی سەرکردە سەربازییەکان وسیفەت وخاسیەتی کەسایەتییان وچۆنیەتی

هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەو سەربازانە کە لە پلەی نزمترن وتاقیکردنەویان بۆ زانینی توانا وبەهرە تایبەتمەندیەکانیان. دیراسەت کردنی گیروگرفتە دەروونییەکانی سەربازان لە ژیانی سەربازیان وداڕشتنی بەرنامەی مەشق کردن وسوود وەرگرتن لە ستراتیجیەکانی فێربوون لە بەکارهێنانی چەك بە هەموو جۆرەکانی، بواری تری دەروونزانین. ئەوە لە کاتی ئاشتی دا، وە لەکاتی جەنگیشدا چالاکی دەروونزانی لەو بوارە زۆرتر وگرنگتر دەبێت بە تایبەتی لە بواری جەنگی دەروونی بە هەموو جۆرەکانی، پروپاگەندە وچەشنەکانی وکردارەکانی مێشك شوشتن وچۆنیەتی بەرز کردنەوەی وورەی سەربازان وبە پێچەوانەش نزم کردنەوە وروخاندنی وورەی سەربازانی دوژمن. لە ڕاستی دا ئەو لقە پاش جەنگی جیهانی یەکەم پەرەی سەند وگەشەی کرد بە تایبەتی لە ئەڵمانیا ولە جەنگی جیهانی[٦] دووەمیش دەورێکی باشی بینی لە سەرکەوتنی هەندێك لەشکر وبەزینی هەندێکی تر. نزیکترین لقی دەروونزانی لەو لقە دەروونزانی کۆمەڵایەتی یە کە سوودێکی زۆری بەو لقە گەیاند لە ڕێی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکانی.

٧. **دەروونزانی کلینیکی:** دەروونی مرۆڤ بەردەوام ساغ ودروست نابێت بەڵکو هەندێك جار لەبەر ئاڵۆزی وگیرگرفتەکانی ژیان تووشی شپرزەیی ونارێکی دێت وهاوسەنگی تێك دەچێت ولەنگەری نامێنێت جا ئەوە چ لە شێوەی پشێوی دەروونی سادە بێت، وەك دڵەڕاوکی (قلق) وخەمۆکی سادە، وەیان پشێوی رەفتار وەك خووگرتن بە رەفتاری خراپ وزمانگیرانی دەروونی وهی تر. دەروونزانی کلینیکی ئەرکی دیراسەت کردنی ئەو حاڵەتانە وچارەسەرکردنیانی خستۆتە سەر شانی خۆی. لێرەدا لەگەڵ پزیشکی دەروونی تێك دەکەنەوە بەڵام لە ڕاستیدا جیاوای نێوان ئەو دوو لقە لەلای قووڵی وئاڵۆزی حاڵەتەکانە چونکە پزیشکی

---

[٦] هەندێك لە ڕۆشەنبیران زاراوەی "جەنگی جیهانی" یان پێ ڕاست نییە چونکە زۆربەی زۆری جیهان بەشداری ئەو جەنگەیان نەکرد وەك: چین وهیندستان ولاتانی ئەفریقیا وولاتانی ئەمریکای باشور وولاتانی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا. بەڵکو جەنگەکە بە پلەی یەکەم جەنگێکی ئەورووپی بوو چونکە هەڵگیرسێنەری ئەو دوو جەنگە وگرنگترین بەشداربووانی ولاتانی ئەورووپا وئەمریکای باکوور بوو.

دەروونی چارەسەری پشێوی دەروونی ورەفتاری ئاڵۆز دەکات، کە پێیان دەڵێین نەخۆشییە دەروونی وژیرییەکان، هەرچی دەروونزانی کلینیکییە خۆی لەو جۆرە حالەتانە لادەدات ومامەڵە لەگەڵ پەشێویە دەروونییە سادەکان دەکات بێ ئەوە هەقی ئەوەی هەبێت دەرمان بەکار بهێنێت لە چارەسەرکردنیدا. لەبەر ئەوە مەرج نییە ئەو کەسەی بە چارەسەرکردن هەڵدەستێت پزیشکی دەروونی بێت بەڵکو توێژەری دەروونی راهێنراو ومۆڵەت پێدراو دەتوانێت بەو کارە هەڵبستێت.

ئەوەی ڕاستی بێت دەروونزانی چەند لقێکی تری هەیە بێجگە لەوانەی کە باس کران بۆ نمونە لە کۆمەڵەی لقە تیۆریەکان دەروونزانی زمانەوانی ودەروونزانی فەلسەفیمان هەیە ولە کۆمەڵەی لقە پراکتیکییەکانیش دەروونزانی بەڕێوەبردن ودەروونزانی فسیۆلۆجیمان هەیە بەڵام چونکە مەبەست لەو کتێبە ئەوەیە کە تەنها ببێتە دەروازەیەك بۆ خوێنەر دەربارەی دەروونزانی، نەك ببێت بە ئینسکلۆپیدیا کە گشت بابەتەکانی دەروونزانی لە خۆیەوە بگرێت، لەبەر ئەوە تەنها ئاماژەیان بۆ دەکەین وبەدرێژی باسیان ناکەین وکتێبی تایبەتی هەن لەو بوارە ئەگەر خوێنەر بیەوێت زانیاری زیاتر دەربارەیان بزانێت.

**خۆت تاقی بکەرەوە!**

١. باسی سێ لق لە لقە تیۆریەکانی دەروونزانی بکە؟
٢. باسی سێ لق لە لقە پراکتیکیەکانی دەروونزانی بکە؟

# شێوازەکانی لێکۆڵینەوە
# لە دەروونزانی

بە شێوەیەکی گشتی (زانست مانای گەڕانە بەدوای زانیاری مەوزوعی وبێ لایەن کە لە ئەنجامی تێبینی کردن وەریدەگرین)[1]. زانست، لە زۆربەی بوارەکانیدا، چوار ئامانجی سەرەکی هەیە:

یەکەم: وەسف کردنی ئەو دیاردەیەی کەلێی دەکۆڵیتەوە واتە هەوڵ دەدات بزانێت چی روویداوە؟

دووەم:تەفسیر کردنی دیاردەکە واتە بزانێت کە دیاردەکە چۆن رووی داوە؟ بە واتایەکی تر کەڕان بە دوای هۆیەکانە.

سێیەم: پێش بینی، واتە پێش ئەوەی دیاردەکە روویدات بزانێت کەی روودەدات وکات وشوێنی دیاری بکات. کەی ولەکوێ ولەژێر چ بارودۆخێك ئەو دیاردەیە لە دوارۆژ روودەدات؟

چوارەم: دەست بەسەر دیاردەکەدا بگرێت واتە چۆن دەتوانرێت دەست بەسەر ئەو دیاردەیە بگیرێت وکۆنترۆل بکرێت؟

ئەو چوار ئامانجی ئەلقەی بەیەکبەستراوی زنجیرەیەکن وهەر یەکەیان پشت بە ئەوەی پێشەخۆی دەبەستێت بۆ نمونە ئێمە ناتوانین تەفسیری دیاردەێك بکەین بێ ئەوەی پێشتر وەسفمان نەکردبێت وە هەروەها ناتوانین پێشبینی دیاردەکە بکەین ئەگەر نەتوانین تەفسیری بکەین وهتد.. لە بواری گەردوون زانی پاش ئەوەی وەسفی ئەستێرەیەك دەکرێت، بە دیاریکردنی قەبارە وجوولە وشوێنی، ئەوا دەتوانرێت بگوترێت ئەو ئەستێرەیە فلانە رۆژ لە فلانە کاتژمێر وخولەك وچرکەدا، ولە فلانە شوێن بەدیار دەکەوێت. دیاردەی رۆژگیران ومانگ گیرانیش دوو نمونەی زەقن لەو بوارە کە گەردوونزانەکان پێش رووداینان پێیان دەزانن. هۆی ئەوەش ئەوەیە کە هەموو شتێك لەو بوونەوەرەدا بە پێی یاسا بەرێوە دەچێت ئینجا ئەگەر ئەو یاسایەمان دۆزیەوە، ئەوا دەتوانین پێشبینی بکەین.

---

[1] التجريب في العلوم السلوكية، جون م. نيل و روبرت م. ليبرت، ترجمة: موفق الحمداني وعبد العزيز الشيخ، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨٢، ص٤.

بەلام مەسەلەی دەست بەسەرداگرتن، کە چوارەم ئامانجی زانستە بە شێوەیەکی گشتی، لە هەموو زانستێکان نایەتەدی. لە بواری پزیشکی دەتوانین دەست بەسەر بلاوبوونەوەی نەخۆشیەکدا بگرین، بەلام ئەو ئامانجە لە بواری گەردوون زانی نایەتەدی. لەوانەیە پسپۆری گەردوونزان بتوانێت بەهۆی تیلیسکۆپەکەی زانیاریەکی زۆر دەربارەی مانگ یان خۆر بزانێت، بەلام ناتوانێت دەست بەسەر جولانەوەی مانگ یان خۆردا بگرێت ونەهێلێت بگیرێن! دەروونزانیش، وەك هەر زانستێکی دیکە، مەبەستی وەسف وتەفسیر کردنی رەفتار وکردارە عەقلییەکانە بە مەبەستی پێشبینی کردنیان لە داهاتوو، بەلام مەسەلەی کۆنترۆل کردنی رەفتاری مرۆڤ هەموو کاتێك نایەتەدی لەبەر چەند هۆیەك، کە هەندێکیان پەیوەندیان بە ئالۆزی دیاردەی رەفتارەوە هەیە و هەندێکی تریان پەیوەندیان بە سنوورە ئەخلاقی وکۆمەلایەتیەکانەوە هەیە. بەلام دەروونزانیش، وەك زانستەکانی تر، چەندەها رێگا وئامرازی زانستی هەیە بۆ لێکۆلینەوە وتوێژینەوە وئەم رێگا وئامرازانەش مەوزوعین وزانستین وروون وئاشکران وچەندەها خاسیەتی تریشیان هەیە کە لێرەدا ماوە نییە بە درێژی باسیان بکەین، ئینجا با بزانین ئەو رێگا وشێوازانە چین کە دەروونزانی پەیرەویان دەکات لە لێکۆلینەوەی بابەتەکانی؟ لە چ کاتێك وبۆ چ حالەتێك بەکاردێن؟ سنووری هەر یەکەیان چۆن دیاری دەکرێت؟

رێگا وشێوازەکانی لێکۆلینەوەی دەروونزانی زۆرن، لێرەدا باسی حەوتیان دەکەین کە بریتین لە تێبینی کردنی زانستیانە، تێرمان، ئەزموون، دیراسەتکردنی حالەتێك، دیمانە، بەدواچوون، تاقی کردنەوە وپێوەرەکان.

### یەکەم: تێبینی کردن

شێوازی تێبینی کردن سەرەتا ویەکەم هەنگاوی زانستە لە هەموو بوارێکدا، کە بە هۆیەوە دەتوانین زنیاری دەربارەی دیاردە بەرجەستەکان کۆبکەینەوە. ئەوەی راستی بێت کرداری تێبینی کردنیش چەند پلە وجۆری هەیە، جۆرێکی بەپەلە وسەرپێیی ئەنجام دەدرێت وەك ئەوەی لە ژیانی رۆژانەماندا دەیکەین بێ ئەوەی مەبەستمان دیراسەت کردنی ئەو شتە بێت کە تێبینی دەکەین بەلکو مەبەستمان تەنها کۆکردنەوەی زانیاریە بەو رادەیەی کە پێویستمان پێیەتی ئەگەر هاتوو

مامەلەمان لەگەل ئەو شتە کرد. بێ گومان ئەو جۆرە تێبینی کردنە زانستی نییە وناتوانین پشتی پێ ببەستین. تێبینی کردنی زانستی بریتییە لە چاودێریکردنی دیاردەیەکی تایبەتی ودیاریکراو وبەشێوەیەکی مەوزوعی بە نیازی لێکۆلینەوەی زانستی وکۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی، وتۆمارکردنی بۆ ئەوەی لە یاد نەچێت. بۆ نمونە دیراسەت کردنی رەفتاری هاوکاری کردن لا مندالان پێویستی بە تێبینی رەفتاریان هەیە لە کاتی کارکردن ویاری کردنیان ووێنەگرتنیان، چ بە کامیرەی ڤیدیۆ یان هەر ئامرازێکی تری تۆمار کردن، لە هەر بارێك کە لەوانەیە بە هاوکاری لەقەلەم بدرێت لای بابای تۆێژەر. لەو حالەتەدا پێویستە تێبینیکار (الملاحِظ) لەبەر چاو نەبێت چونکە لەوانەیە ئاشکرابوون وبەدیارکەوتنی ببێتە هۆی ئەوەی رەفتاری منداله تێبینی کراوەکان سروشتی نەبێت. دەکرێت کەسێك یان زیاتر لە کەسێك کرداری تێبینی کردن ئەنجام بدان بە مەبەستی دابین کردنی راستی ودروستی زانیاریە کۆکراوەکان وبەدوور خستنەوەی فاکتەری خودی تێبینیکار لە کرداری تۆمارکردنی زانیاریەکان.

دەتوانرێت تێبینی کردن لە تاقیگە وەیان لە حالەتی سروشتی ئەنجام بدرێت ئەوەش بەندە بە سروشتی دیاردەکە وبەو شێوەیەی کە سەلامەتی تێبینی کردن دابین دەکات. بۆ نمونە دیراسەت کردنی داب ونەریتی کۆمەلگا سەرەتاییەکان لە بواری کۆمەلایەتی وئابووری وهتد.. ناگونجێت کە لە تاقیگە ئەنجام بدرێت چونکە ناکرێت ئەو کۆمەلگایە بهێنین بۆ تاقیگە ئنیجا تێبینی رەفتاریان بکەین! هەلبەتە ئەو شێوازە راست وزانستی نییە وئەنجامەکەشی بێ سوودە لەبەر ئەوە پێویستە ئەو دیاردەیە لە بواری سروشتی خۆیدا تێبینی بکرێت. بەلام دەتوانین چەند مشك وجورجێك پەیدا بکەین و لەتاقیگە ئەزموون وتاقی کردنەوەیان لەسەر ئەنجام بدەین.

لەوانەیە تێبینیکار بەشداری لەو تاقی کردنەوەیە بکات کە تێبینی دەکات و جۆرە پێی دەگوترێت تێبینی بەشدار ولەوانەیە یەکێك لە توێژەرەکان بەشداری تاقی کردنەوە وئەزموونەکە بکات وتوێژەرێکی تر تێبینی حالەتەکە بکات وزانیاری دەربارەی تۆمار بکات.

ئەو چەشنە تێبینییانەی باسمان کردن تەنها لایە دیار وبەرچاوەکانی دیاردە ئاشکرا دەکات بەلام لای ناوەوە ودەروونییەکان بەدیار ناخات. ئیجا بۆ نەهێشتنی ئەو خالە لاوازە لە شێوازی تێبینی کردندا، توێژەرەکان شێوازێکی تر لە تێبینی کردن بەکار دەهێنن پێی دەگوترێت تێبینی کردنی پێوەلکاو یان فرێدراو (الملاحظة الإسقاطية). تێبینیکار لە جۆرە شێوازە هەول دەدات، بۆ ئەوەی لایەنی ناوەوەی دیاردەکە یان رەفتارەکە بەدیار بخات، بۆ ئەوەی خۆی لە جێگای کابرای تێبینیکراو دابنێت و شارەزایی خۆی بێنێتەوە یاد کە ئەگەر ئەولەو جۆرە مەوقفەدا بووایە هەستی بە چ دەکرد؟ شایەنی باسە کە ئەو جۆرە تێبینی کردنە زۆر راست نییە چونکە بۆ نمونە باری دەروونی مندال (تێبینیکراو) زۆر جیاوازە لەگەل هی پیاو (تێبینیکار)، یان هی ئافرەت جیاوازە لەگەل هی پیاو وهتد.. لەبەر ئەو هۆیانە شێوازێکی تر بەکار دەهێنرێت کە پێی دەگوترێت تێڕامان.

### دووەم: تێڕامان

مەبەست لە تێڕامان (الاستبطان) ئەوەیە کە مرۆڤ تێبینی ووەسفی باری دەروونی خۆی بکات ئینجا چ لە حالەتی دلخۆشی یان غەمباری یان تورەیی یان حالەتی بیرکردنەوە وەیان هەر حالەتێکی دەروونی تر، پاشان هەلبستێت بە شی کردنەوە ولێکدانەوەی ئەو حالەتە چ لە کاتی ئێستا بێت یان لە رابردوو. ئەو شێوازە لەسەر حەقیقەتێك دامەزراوە کە دەلێت مرۆڤ لە هەموو کەس باشتر دەتوانێت وەسفی باری دەروونی ناوەوەی خۆی بکات. لە ژیانی رۆژانەماندا ئەو شێوازە بەکار دەهێنین بەلام بەشێوەیەکی سەرپێیی ونازانستانە چونکە ئەو کردارە پێویستی بە مەشق وراهێنان وشارەزاییەکی باش هەیە بە تایبەتی ئەگەر بە مەبەستی لێکۆلینەوەی زانستی بێت.

تێڕامان شێوازێکی سەرەکی بوو لە چەند قوتابخانەیەکی دەروونی وەك پەیوەستکاری ووەزیفی وگشتالت بەلام لەلایەن قوتابخانی رەفتارکاری رەخنەیەکی زۆری لێ گیرا کە لە راستیدا رەخنەکان بەجێن، بۆ نمونە دەلێن تێڕامان هەرچەندە بە زیرەکی و لێزانی ئەنجام بدرێت هەر کردارێکی خودی (زاتی) یە، واتە نە دەتوانرێت دووبارە بکرێتەوە ونەکەسێکی تر دەتوانێت تێبینی

وتۆماری بکات، وەهەروەها هەندێك حالەتی دەروونی هەیە کە مرۆڤ ناتوانێت بە زمان وسفیان بکات یان دەریان ببڕێت ولە هەمان کاتیشدا باری دەروونی مرۆڤ لە کاتی تێڕامان دەگۆڕێت ومرۆڤ ناتوانێت هەم تێبینیکار وهەم تێبینیکراو بێت لەهەمان کاتدا. ئەوە وچەندەها رەخنەی تریش کە ئاراستەی ئەو شێوازە کرا وبووە هۆی سست بوونی کاریگەری، بەلام لەگەل ئەوەشدا تێڕمان شێوازێکی سوود بەخشە بە تایبەتی ئەگەر مەرجە زانستییەکانی تێدا رەچاو بکرێت ولە سنووری دیاریکراوی خۆیدا جێ بەجێ بکرێت، بۆ نمونە لە دیراسەت کردنی بابەتی زانین، تێڕامان بە سەرەتا وهەنگاوێکی پێویست دادەنرێت لە دامەزراندنی پەیوەندی دەروونی یە فیزیاویەکان[٢].

## سێ یەم: تاقی کردنەوە وپێوەرەکان

دەروونزانی ئەمەریکی ئیدوارد ثورندایك دەلێت: "هەموو شتێك رێژە وچەندیەتی هەیە کەواتە هەموو شتێك دەشێت بپیورێت". ئەوەی راستی بێت قورئانی پیرۆز پێش ئەوە بە چەند سەدەیەك ئاشکرای کردووە کە خودا هەموو شتێکی بە رێژەیەکی دیاریکراو دروست کردووە، جا ئەو شتە چ ماددی بێت چ مەعنوی[٣].
پێوەر وتاقی کردنەوە سایکۆلۆجیەکان لەسەر ئەو راستی یە دامەزراون بە مەبەستی دیاریکردنی چەندیەتی دیاردە دەروونی یەکان.

پێوەرە سایکۆلۆجیەکان دوو جۆرن: تاقی کردنەوەی بە زمان وتاقی کردنەوەی بە کردار[٤]. جۆری یەکەم بریتیە لە کۆمەلە پرسیارێك دەربارەی ئەو دیاردەیەی کە دەمانەوێت بیپێوین ئینجا ئەو دیاردەیە چ ئاستی زیرەکی بێت یان رێژەی فێربوون یان کەسایەتی یان هەر سیفەت وبەهرەیەك بێت. ئاشکراترین نمونە بۆ ئەو جۆرە پێوەرانە ئەو تاقی کردنەوانەن کە مامۆستایان لە قوتابخانەکان ئەنجامیان دەدەن بەمەبەستی زانینی ئاستی فێربوونی قوتابی وخوێندکاران لەو

---

[٢] مناهج البحث في علم النفس، اشراف: أندروز، ترجمة: د. يوسف مراد، مصر: دار المعارف، ١٩٥٩.
[٣] "إنا كل شيء خلقناه بقدر" (سورة القمر: ٤٩).
[٤] پێوەرەکانی بە چەند شێوەیەکی تریش پۆلێن دەکرێن وەك: پێوەرە تاکیەکان وپێوەرە کۆمەلیەکان...

بابەتانەی کە خوێندوویانە، بۆ نمونە تاقی کردنەوەی بابەتی مێژوو، یان زمانی ئینگلیزی وهتد..دیارە ئەو تاقی کردنەوانەش لە چەند پرسیارێك پێك دێن وقوتابی پێویستە وەلامیان بداتەوە، چ بە قسە چ بە نووسین. ئینجا بە پێی ولامدانەوەی ئەو پرسیارانە، نمرە دادەنرێت وئاستی تاقیکراو دەخەملێنرێت.

لە جۆری دووەم لە پێوەرەکان داوا لە تاقیکراو دەکرێت کە بەچەند کردارێك هەلبستێت وەك جیا کردنەوەی دوو ئەلقە یان دروست کردنی چوار چوارگۆشە بە شەش دەنکە شقاتە وهتد.. ئینجا بە پێی چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەو کردارانە، وکەوتنی یان سەرکەوتنی لەو کارانە، نمرە بۆ تاقیکراو دیاری دەکرێت. ئەو جۆرە تاقی کردنەوانە لە ئامادەییە پیشەییەکان وچەند کۆلێژێك وەك کۆلیژی پزیشکی وئەندازە وهەندێك لە بەشەکانی کۆلیژەکانی زانیاری وپەروەردە وپەیمانگا تەکنۆلۆجی و پزیشکی یەکان، ئەو جۆرە پێوەرە بەکار دەهێنرێت.

ئەوەی راستی بێت پێوانی زیرەکی کەسێك وەك پێوانی بەژن وبالای ئەو کەسە ئاسان نییە وشتێکی بەلگەنەویستە کە پێوانی شتە ماددی یەکان ئاسانتر وراستتر ووردترە لە پێوانی شتە نامادی یەکان (دەروونی یەکان) ئەوەش لەبەر چەند هۆیەك:

١. پێوانی شتە ماددی یەکان بە شێوەیەکی راستەوخۆ ئەنجام دەدرێت کەچی دیاردە دەروونی یەکان پێویستە بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ بپێورێن.

٢. پێوەرەکانی شتە ماددی یەکان یەکەیەکی چەسپاو ونەگۆڕیان هەیە وەك گرام وسانتیمەتر وهتد، هەرچی پێوەرە دەروونی وسایکۆلۆجیەکانە یەکەکانی ڕەها وجێگیر ونەگۆڕ نین وەك جۆری یەکەم بەلکو گۆڕانیان تیادا ڕوو دەدات.

٣. سروشتی دیاردە دەروونیەکان ئالۆزتر وتەماوی ترە ئەگەر بەدیاردە سروشتییە ماددی یەکان بەراورد بکرێن.

ئەو ڕەخنانە وەنەبێ هەموو بەها وگرنگیەك لەو جۆرە پێوەرانە دابمالێت بەلکو ئەو شێوازە بەردەوام بەکار دەهێنرێت بە تایبەتی لە دەزگای پەروەردەیی یەکان وهی تریش چونکە هەتا ئێستا ئەلتەرنەتیڤی نییە.

٤. بەدواچوون (الطريقة التتبعية Follow-up method)

ئەو جۆرە شێوازە لەگەڵ ئەو دیاردانە بەکار دەهێنرێت کە بە چەند قۆناغ وهەنگاوێك گەشە ونەشونمایان تەواو دەبێت وەك زیرەکی وزمان وهتد.. توێژەر لەکاتی بەکارهێنانی ئەو شێوازە هەڵدەستێت بە پیوانی دیاردەکە لە چەند قۆناغێکی جیاواز ئینجا بەراوردیان لە نێوان دەکات وچەند ئەنجامێکی دەست دەکەوێت. ئەو شێوازە دوو چەشنی هەیە:

**چەشنی یەکەم: شێوازی درێژایی** (الطريقة الطولية Longitudinal method)

ئەو توێژەرەی کە ئەو شێوازە بەکار دێنێ هەڵدەستێ بە دیراسە کردنی کەسێك یان چەند کەسێك بۆ ماوەیەکی درێژ کە لەوانەیە بگاتە بیست یان سی ساڵ! بۆ نمونە لێکۆلینەوەکەی (لویس ترمان) بیست وپێنج سالی خایاند. ئینجا توێژەر ئەو گۆرانانە تۆمار دەکات کە بەسەر دیاردەکە هاتووە لەو ماوەیەدا. بۆ نمونە ئەگەر بمانەوێت دیراستەتی درێژی کەسێك بکەین لەسەرەتای لە دایك بوونی هەتا تەمەنی بیست ساڵ ئەوا هەلدەستین بە پیوانی درێژی کەسەکە لەکاتی لە دایك بوونیدا وپاشان لە تەمەنی یەك مانگی دا ودوای لە تەمەنی دوو مانگی وە هەروەها هەتاکو تەمەنی بیست سالی. بەو شێوەیە دەتوانین ئەو ماوەیە دیاری بکەین، جا چ بە مانگ بێت یان بە ساڵ، کە گەشەکردنی درێژی خێراو بە پەلە بوو وئەو کاتەی کە سست ولاواز بووە. بەم جۆرەش دەتوانین دیراسەتی گەشەکردنی دیاردەکانی وەك ژیری (عقل) وتاوگیری (انفعال) وپەیوەندی کۆمەلایەتی ئەنجام بدەین. دەروونزانی فەرەنسی بەناوبانگ جان پیاجێ لە دیراسە کردنی زیرەکی دوو منداڵەکەی ئەو شێوازەی بەکار هێنا وزانیاریەکی زۆریشی بە دەست کەوت لەو رێگایەوە کە توانی بیردۆزی خۆی لەسەریان دابمەزرێنێ.

هەرچەندە ئەو شێوازە زانیاری وردمان دەربارەی دیاردەکان دەداتێ وسوودێکی زۆریشی هەیە، بەڵام چەند رەخنەیەکی لێ گیراوە وەك:

أ.

ب. نەتوانینی بەگشت کردنی (تعمیم) ئەنجامەکان بە ئاسانی چونکە لە زۆربەی حالەتەکان تاک تاکن وچەند رەخنەیەکی تریشی لێگیراوە کە وایکرد دەروونزانەکان شێوازی پانایی بەکار بهێنن.

**چەشنی دووەم: شێوازی پانایی** (الطريقة العرضية Cross-sectional method)

بە پێی ئەو شێوازە، توێژەر کۆمەلە کەسێك هەلدەبژێرێت، واتە نمونەیەك لە کۆمەل یان کورد گوتەنی: مشتێك لە خەوارێك، بە شێوەیەکی هەرەمەکی (واتە عشوائی°) بە مرجێك گشت قۆناغەکانی گەشەکردنی دیاردەکە بنوێنن. بۆ نمونە ئەگەر بیەوێت دیراسەتی درێژی بالا بکات وقۆناغە خێرا وسستەکانی دەست نیشان بکات، ئەوا هەلدەستێت بە هەلبژاردنی، بۆ نمونە سەد کەس، بە شێوەیەکی هەرەمەکی وهەرچەندە ئەو نمونەیە (عینە) گەورەتر بێت باشترە، بە مەرجێك هەر یەکەیان قۆناغێکی تەمەن بنوێنن، واتە یەکێکیان تەمەنی مانگێك بێت ودووەمیان دوو مانگ وهتد.. وهەتا ئەو تەمەنەی کە دەمانەوێ دیراسەی بکەین. ئینجا توێژەر هەلدەستێ بە پیوانی درێژی ئەو سەد کەسە وبەو شێوەیە دەتوانێت بزانێت لە چ تەمەنێك گەشەکردنی درێژی خێرا یان سست دەبێت. لە خاسیەتە باشەکانی ئەو شێوازە ئەویە کە:

أ. پێویست بە کاتێکی زۆر ناکات

ب. دەتوانین ئەنجامەکانی بەسەر ئەو کۆمەلە (تعمیم) بکەین کە نمونەکەی لێ وەرگیراوە.

بەلام ئەو شێوازەش چەند رەخنەیەکی لێگیراوە بۆ نمونە ئەو زانیاریانەی کە بەو رێگایە بەدەست دەکەوێت زۆر ورد نین بەلکو گشتین وتوێژەر بەو شێوازە ناتوانێت هاوکات دیراسەی چەند دیاردەیەکی تریش بکات کە پەیوەندی بەو دیاردەیە هەیە کە لێی دەکۆلێتەوە. باشترین چارە بۆ ئەو رەخنانە ئەوەیە کە هەردوو شێواز، درێژایی و پانایی، بەکاربهێنرین لە کاتی دیراسەکردنی دیاردە سایکۆلۆجیەکاندا.

---

° زاراوەی عشوائی، مانای وایە هەموو تاکەکانی ئەو کۆمەلەی کە دیراسەی دەکەین، دەرفەتی یەکسانیان هەیە بۆ بەشداری بوون لە لێکۆلینەوەکە.

### ٥. لێکۆلینەوەکانی تاکە حالەت (دراسات الحالة Case studies)

ئەو شێوازە لە بواری چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونی وعەقلییەکان بەکار دێت و بریتییە لە دیراسە کردنی باری دەروونی بابای نەخۆش یان خاون گیروگرفت لە رێگای کۆ کردنەوەی زانیاری دەربارەی ژیانی رابردووی، هەر لە قۆناغی مندالیەوە هەتا کاتی تووش بوونی، بە مەبەستی دەست نیشان کردنی نەخۆشیەکە وهۆیەکانی.

شێوازی دیراسەکردنی ژیانی کەسایەتی ( Biography Method ) کە لە شێوازی لێکۆلینەوەی تاکە حالەت دەچێت، لە کاتی دیراسەکردنی ژیانی کەسایەتییە بەناوبانگەکان، چ لە بواری ئەدەب، هونەر، زانست، یان وەرزش، بەکار دەهێندرێت.

ئەو دوو جۆرە شێوازە دەخرێنە ژێر ناوی لێکۆلینەوە مێژووییەکان؛ واتە توێژەر پشت بەو زانیاریانە دەبەستێت کە لە سەرچاوە بروا پێکراوەکان، بۆ نمونە کەس وکارو خزم وناسیاوی نەخۆش، یان سەرچاوە پێکراوەکان، کە دەربارەی ژیانی کەسایەتییە بەناوبانگەکە، زانیاریان بلاوکردۆتەوە. پاشان هەلدەستێ بە شی کردنەوەی ئەو زانیاریانە کە لەو سەرچاوانە دەستی کەوتووە بە مەبەستی ئەوەی کە باشتر وروونتر لەو کەسایەتی یە بگات. فرۆید لە کتێبی (التحلیل النفسی والفن) ئەو شێوازەی پیادە کردووە بۆ دیراسە کردنی کەسایەتی نیگارکێشی ئیتالی بەناوبانگ (لیۆناردۆ دافینشی) ورۆماننووسی روسی ناودار (تیۆدۆر دیستۆفسکی). بەلام لە کاتی شیکردنەوەی زانیاریەکان، فرۆید رێباز وشێوازی تایبەتی خۆی بەکارهێناوە کە لە باسی قوتابخانەی شیکاری دەروونی بە کورتی ئاماژەمان بۆی کرد.

### ٦. لێکۆڵینەوە پەیوەستیەکان (الدراسات الارتباطیة Correlational studies)

ئەو گەردوونەی تێیدا دەژین زۆر رێك وپێکە وهەموو بەشەکانی، بە گچکە وگەورەوە، بە یەکەوە بەستراون. ئینجا کە هەر دیاردەیەك روو دەدات بێ گومان پەیوەندی بە چەند دیاردەیەکی تر هەیە وئەرکی زانست بریتی یە لە دۆزینەوەی ئەو جۆرە پەیوەندیانە. لە بواری دەروونزانیش دیاردەکە بەیەکەوە بەستراون، بۆ

نمونە کەسایەتی مرۆڤ بە پرۆسەی پەروەردە کردن بەستراوە وئەویش پەیوەندی هەیە بە ئاستی فێربوونی دایك وباوك وهتد..

شێوازی لێکۆلینەوەکانی پەیوەستی هەوڵ دەدات پەیوەندی نێوان دیاردە دەروونی یەکان ورەفتار بدۆزێتەوە، وەك پەیوەندی نێوان مەی خواردنەوە وتاوان، یان نێوان زیرەکی وئاستی ئابوری، یان نێوان خۆکوشتن وخەمباری، وەیان نێوان نەخۆشی شیزۆفرینیا وفاکتەری بۆماوە وهتد.. بۆ زێدە روون کردنەوە با نمونەیەك بهێنینەوە وبپرسین: ئایا چ پەیوەندی هەیە نێوان بالا بەرزی وزیرەکی لا خوێندکاری کوڕ؟ بۆ وەلامدانەوەی ئەو پرسیارە پێویست دەکات لێکۆڵینەوەیەکی پەیوەستی ئەنجام بدەین بۆ دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان ئەو دوو فاکتەرە. لەو نمونەیە دوو گۆڕاو (متغیر) هەن، یەکەمیان بریتییە لە بالا بەرزی ودووەمیان زیرەکی. ئینجا کۆمەڵێك خوێندکاری زانکۆ هەڵدەبژێرین بە شێوەیەکی هەڕەمەکی (واتە عشوائی)، گریمان ١٠ خوێندکار بوون. پاشان هەڵدەستین بە پیوانی بالایان وپیوانی ئاستی زیرەکیان، لە رێگای تاقی کردنەوەکانی زیرەکی. لە ئەنجامدا هەر خوێندکارێك دوو نمرەی دەبێت: یەکێکیان ئاماژە بۆ درێژی بالا دەکات وئەوی تریان بۆ ئاستی زیرەکی.

دەتوانرێت بە هۆی هاوکێشەی پیەرسۆن، ئەو زانیاریانە شی بکرێنەوە وئەنجامان بکەوێتە دەست وبزانین ئایا چ پەیوەندیەك نێوان ئەو دوو فاکتەرە هەیە یان نا. هەر چۆنێك بێت، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی پەیوەستی لە ١+ زیاتر نابێت ولە ١- کەمتر نابێت ولەوانەشە ئەنجامەکە سفر بێت. ئەگەر ئەنجامی هاوکێشەکە سفر بوو، ئەوە مانای وایە هیچ پەیوەندیەك نێوان ئەو دوو گۆڕاوە نی یە.. بەلام ئەگەر ئەنجامەکە نزیك بوو لە ١+ ئەوە مانای وایە پەیوەندیەکی بەهێزی راستەوخۆ نێوان ئەو دوو گۆڕاوەدا هەیە. مەبەست لە پەیوەندی راستەوانە ئەوەیە کە ئەگەر فاکتەرێك زیاد بکات ئەوی تریشیان زیاد دەکات، واتە ئەوانەی بالا بەرزن ئاستی زیرەکیشیان بەرزە. بەلام ئەگەر ئەنجامەکە نزیك بوو لە ١- ئەوە مانای وایە کە پەیوەندیەکی بەهێزی پێچەوانە نێوانیان هەیە، واتە ئەگەر فاکتەرێك زیادی کرد

ئەوی تریان کەم دەکاتەوە، ئەوەش مانای وایە ئەوانەی باڵایان بەرزە ئاستی زیرەکییان نزمە وپێچەوانەکەشی راستە.

خشتە ١: پەیوەندی نێوان باڵا بەرزی وزیرەکی لای خوێندکاران

| خوێندکار | نمرەی درێژی باڵای | نمرەی ئاستی زیرەکی |
|---|---|---|
| کاوە | ١٧٥ | ١١٥ |
| شوان | ١٧٠ | ١٢٠ |
| سەربەست | ١٨٢ | ١١٧ |
| گۆڤەند | ١٦١ | ١١٩ |
| رەنج | ١٦٥ | ١٢١ |
| رابەر | ١٧٧ | ١١٥ |
| شەماڵ | ١٨٣ | ١٢١ |
| نوزاد | ١٦٦ | ٩٨ |
| هێمن | ١٧٠ | ١١٣ |
| هەژار | ١٨١ | ١٠٠ |

ئەوەی راستی بێت ئەو شێوازە وشێوازەکانیش تریش کە باسمان کردن کەموکورتیەکی هاوبەشیان هەیە ئەویش ئەوەیە هیچیان پەیوەندی هۆیەتی (العلاقه السببيه) نێوان فاکتەرەکان دیاری ناکەن، واتە نازانین کام فاکتەر هۆیەو کامیان ئەنجامە؟ لەبەر ئەوە باشترین شێوازی لێکۆڵینەوە وتەنها شێواز بۆ دەست نیشان کردنی پەیوەندی هۆیەتی نێوان فاکتەرەکان، چ سروشتی بن یان دەروونی یان کۆمەڵایەتی، بریتییە لە شێوازی ئەزموونگەری.

٧. **ئەزموونگەری** (الطريقة التجريبية Experimental method)

لەبەر ئەوەی هیچ کام لەو شێوازانەی کە ئاماژەمان بۆ کردن، فاکتەرەکان تیایاندا کۆنترۆل ناکرێن، بۆیە ناتوانین پەیوەندی هۆیەتی بدۆزینەوە. لە ئەزموونـدا، توێژەر دەتوانێت فاکتەرەکان کۆنترۆل بکات وچۆن بیەوێت بیان گۆرێت. بەو شێوەیە کاریگەری ئەو فاکتەری لەسەر فاکتەرێکی تری بۆ ئاشکرا دەبێت. با ئەو شێوازە بە نمونە روون بکەینەوە.

یەکەم هەنگاو لە ئەنجام دانی ئەزموون (تجربة) بریتیە لە دانانی گریمانێك (فرضية) کە بریتییە لە رستەیەك کە ئاماژە بۆ پەیوەندیکی دیاریکراو نێوان دوو فاکتەر، دیاردە، یان زیاتر دەکات. بۆ نمونە گریمان گوێ گرتن لە مۆسیقای کلاسیکی بەرهەمی کرێکاران زیاد دەکات.

دووەم هەنگاو بریتییە لە تاقی کردنەوەی ئەو گریمانە، واتە بزانین راستە یان نا. ئینجا هەڵدەستین بە دیاریکردنی گۆڕاوەکان، یان فاکتەرەکان، کە دوو جۆرن:

١. گۆڕاوی سەربەست (المتغير المستقل Independent Variable) یان گۆڕاوی ئەزموونی (المتغير التجريبي Experimental Variable) کە بریتییە لەو مەرج ووریاکەرەوانەی کە توێژەر دەستیان بەسەردا دەگرێت ودەیان گۆڕێت.

٢. گۆڕاوی پشت بەست (المتغير التابع أو المعتمد Dependent Variable) کە بریتییە لەو رەفتارانەی کە پاش بەکار هێنانی گۆڕاوی سەربەست دەپورێن[٦].

لە نمونەکەماندا گوێ گرتن لە مۆسیقا گۆڕاوی سەربەستە کە توێژەر بەکاری دێنێت بۆ دیاریکردنی کاریگەری لەسەر بەرهەم هێنان، واتە لەسەر گۆڕاوی پشت بەست. ئینجا بۆ ئەو مەبەستە، توێژەر کۆمەڵێك کرێکار لە کارگەیەك هەڵدەبژێرێت، بە شێوەیەکی هەرەمەکی، وپاشان بۆ دوو گروپ دابەشیان دەکات بە مرجێك هەردوو گروپ لە هەموو لایەکەوە یەکسان بن. پاشان گۆڕاوی سەربەست لەگەڵ گروپێك بەکار دێنێ کە پێی دەگوترێت گروپی ئەزموونی (المجموعة التجريبية Experimental Group) واتە ئەو گروپە لە کاتی کارکردندا گوێ لە مۆسیقای کلاسیکی دەگرن. گروپی دووەم، کە پێی دەگوترێت گروپی کۆنترۆل کراو (المجموعة الضابطة Control Group) گۆڕاوی سەربەستیان لەگەڵ بەکار ناهێنرێت، واتە بە شێوەی ئاسایی کاردەکەن بێ ئەوەی گوێیان لە مۆسیقا بێت. پاش تێپەڕ بوونی ماوەیەك، کە توێژەر دیاری دەکات، با بڵێین مانگێك، توێژەر بەرهەمی هەردوو گروپ دەپێوێت وبەراوردیان دەکات. ئینجا ئەگەر بەرهەمی گروپی ئەزموونی زیاتر بوو، واتە ئەو گروپەی کە گوێیان لە مۆسیقای دەگرت لە کاتی کارکردنیاندا، ئەوە مانای وایە کە گوێ گرتن لە مۆسیقای کلاسیکی دەبێتە هۆی زیاد بوونی بەرهەمی کرێکاران.

---

٦ التجريب في العلوم السلوكية، ص٢١.

ئەوەش مانای وایە گریمانەکەمان ڕاست بوو. بەڵام ئەگەر ئەنجامەکە بە پێچەوانە بوو، واتە بەرهەمی گروپی ئەزموونی کەمتر بوو لە بەرهەمی گروپی کۆنترۆل کراو، ئەوە مانای وایە کە گوێ گرتن لە مۆسیقا دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی بەرهەم. واتە گریمانەکەمان راست نەبوو. لەوانەشە بەرهەمی هەردوو گروپ یەکسان بێت، لەو حالەتەدا دەڵێین گوێ گرتن لە مۆسیقا هیچ کاریگەری نییە لەسەر بەرهەم هێنان. ئەوەش دیسان مانای وایە کە گریمانەکەمان راست نەبووە وپێویستە چاوی پێدا بخشێنینەوە.

ئەوەی راستی بێت ئەو نمونەیە زۆر سادە وساکارە وتەنیا بە مەبەستی نزیک کردنەوەی بابەتەکە باسمان کرد. ئەزموونی سایکۆلۆجی زۆر لەوە گرانتر وئاڵۆزترە ودەروونزانەکان چەندەها مەرج وسنووری هەمەجۆریان بۆ ئەنجامدانی ئەزموون داناوە بۆ ئەوەی ساغ وسەلامەتی ئەزموونەکە دابین بکرێت ورەخنەی لێ نەگیرێت وئەنجامەکەشی مایەی پشت پێ بەستن بێت. ئەو مەرجانەش دوو جۆرن: مەرجەکانی سەلامەتی ناوەوە ومەرجەکانی سەلامەتی دەرەوە. لە نمونەی پێشوو ئەگەر ئەو دوو جۆرە مەرجە لە ئەزموونەکە نەیەتەدی، ئەوە لەوانە ئەنجامی ئەزموونەکە چەواشەمان بکات وگریمانەکە بەراست بزانین لەو کاتەی کە چەوتە.

**خۆت تاقی بکەوە!**

١. زانست چییە؟ ئامانجەکانی چین؟
٢. جۆرەکانی تێبینی کردن چین وکەم وکورتیەکانی چین؟
٣. هەندێك لەو رەخنانە باس بکە کە ئاراستەی شێوازی تێڕامان کراوە.
٤. پێوەرەکان دەکرێن بە دوو جۆر؟ ئەو جۆرانە چین؟
٥. باسی چەشنەکان بەدواچوون بکە ولایەنی باشی وخراپی هەر چەشنێك دیاری بکە.
٦. بە نمونە شێوازی لێکۆڵینەوەی پەیوەستی روون بکەوە.
٧. ئەو شتە چییە کە تەنیا شێوازی ئەزموونگەری پێشکەشی دەکات؟

# هەست کردن

هەست بناغە وبنچینەی ژیانی دەروونییە ویەکەم ئەلقەیە لە زنجیرەی ژیان. کەس نکۆڵی لە گرنگی هەست ناکات وبێگومان ژیانێکی ڕاستەقینە بەبێ هەست ئەستەمە ونایەتەدی.

هەر لەمێژەوە وا فێرکراوین کە مرۆڤ تەنها پێنج هەستی هەیە کە بریتین لە بینین وبیستن وتام کردن وبۆن کردن وبەرکەوتن (لمس). لەوانەشە بیستوومانە کە هەستی شەشەم یان حەوتەمیش هەیە، کە مەبەست توانا پاراسایکۆلۆجیەکانە. ئەوەی ڕاستی بێت مرۆڤ خاوەنی یازدە هەستە وئەو پێنجەی تازە باسمان کردن سەرەکین وشەشەکەی تریش ئەمانەن: هەست کردن بە گەرمی، هەست کردن بە ساردی، هەست کردن بە ئازار، هەست کردن بە هاوسەنگی، هەست کردن بە جوڵانەوەی لەش، وهەست کردن بە پاڵەپەستۆ. هەر یەك لەو هەستانە ئەندامی تایبەتی خۆیان هەیە کە یارمەتی هێنانەدی ئەو هەستانە دەکەن. باشە مرۆڤ چۆن هەست دەکات؟

کرداری هەست پێویستی بە سێ لایەن هەیە: شتە هەستپێکراوەکە، ئەندامی هەست، ومێشك. شتە هەستپێکراوەکان، هەندێك جار بە ورياکەرەوە (منبە) وهەندێك جاری تریش بە وروژێنەر (مثیر) ناودەبرێن، چوار جۆرن:

أ. ورياکەرەوەی کیمیاوی، کە بە هۆی بۆن وتام کردن هەستیان پێدەکەین.
ب. ورياکەرەوەی روناکی، کە چاو ئەندامی هەستیەتی.
ت. ورياکەرەوەی گەرمی، کە ئەندامی هەستی پێستە.
پ. ورياکەرەوەی میکانیکی، کە ئەندامی هەست پێکردنی لەشە بە گشتی وچەند ناوچەیەکی تایبەتی تیایدا.

ورياکەرەوە، بۆ ئەوەی وريامان بکاتەوە، پێویستە بگاتە ئاست وپلەیەکی دیاریکراو بۆ ئەوەی بتوانێت ئەندامی هەست وريابکاتەوە. بۆ نمونە هەر دەنگێك لەرینەوەی (واتە ذبذبة) لە ٢٠ کەمتر بێت لە یەك چرکەیەکدا، یان لە ٢٠٠٠ لەرینەوە لە چرکەیەك زیاتر بێت ئەوا هەستی پێ ناکەین ونایبیستین چونکە ئەو جۆرە لەرینەوەیە ناتوانێت ئەندامی هەست لە گوێچکە وريابکاتەوە. لێرەدا چەمکی

دەرماڵی هەست، واتە: عتبة الإحساس (Sensory threshold) روون دەبێتەوە کە بریتی یە لە کەمترین وزە کە پێویستە هەر ورياكەرەوەيەك هەيبێت بۆ وریاکردنەوەی ئەندامەکانی هەست. هەر ئەندامێکیش دوو دەرماڵی هەیە: یەکەم دەرماڵی بەرەڵا، کە تازە باسمان کرد، ودووەمیان دەرماڵی باڵا، کە بریتیە لە بەرزترین رادەی وزەی وریاکەرەوە کە ئەندامی هەست لەوە زیاتر پێی قەبول ناکرێت. ئێستاش با بزانین وریاکەرەوە چۆن کار لە ئەندامی هەست دەکات؟

هەستە خانەکان[1] (واتە الخلايا الحسية) بە ژمارەیەکی زۆر لە ژێر پێستدا هەن کە پێیان دەگوترێت: نیۆرۆن، کە چەند شێوەیەکی جیاوازی هەیە وچەند مادەیەکی کیمیاوی تێدایە وەك مادەی کۆلین وترشی ئەستیل ومادەی کۆلینزتریس. کاتێك وریاکەرەوەیەك ئەو نیۆرانانە دەوروژێنێت، ئەو مادانە کار لەیەکتر دەکەن ووزەیەکی کارەبایی دروست دەبێت لەناو خانەکەدا. لە ماوەیەکی زۆر زۆر کورت، ئەو وزە کارەباییە بۆ خانەکەی تەنیشتی باز دەدات هەتا دەگاتە کۆئەندامی دەمار.




شێوە ١: وێنەی هەستە خانە (نیۆرۆن)

---

[1] هەندێك جار دەکرێنە هەستی وجولەیی، وهەندێك جار دابەش دەکرێن بۆ: نێنەر وهێنەرو گەیێنەر.

كۆئەندامی دەمار لە دوو بەشی سەرەكی پێك دێت:

یەكەم: ناوەندە كۆئەندامە دەمار (الجهاز العصبي المركزي ) كە لە مێشك ودڕكە پەت پێك دێت.

دووەم: لاكۆئەندامە دەمار (الجهاز العصبي المحيطي أو الطرفي ) كە لە سێ بەش پێك دێت: مێشكە دەمارەكان (الأعصاب المخية) ودڕكە دەمارەكان (الأعصاب الشوكية) وكۆئەندامی دەماری سەربەخۆ.

كۆئەندامی دەمار ئاڵۆزترین وگرنگترین كۆئەندامی دەماری مرۆڤە لەبەر ئەوە زانایانی بایۆلۆجیا وفسیۆلۆجیا ودەروونزانی فسیۆلۆجی بایەخێكی گرنگیان پێداوە وبە یارمەتی پێشكەوتنی تەكنۆلۆجی توانیوانە پەردە لەسەر سروشتی ئەو كۆئەندامە لادەن، بەڵام هەتا ئێستاش زانیاریمان دەربارەی زۆر كەمە، بە تایبەتی، چۆنیەتی كاركردنی مێشك. لێرەدا بە كورتی باس ئەو كۆئەندامە زێدە گرنگە دەكەین.

مێشكی مرۆڤ نزیكەی ١٤ بلیۆن نیورۆنی تێدایە وبەشێوەیەكی گشتی كێشەكەی نزیكەی ١٤٨٠ گرامە[٢]. ئەگەر لە سەرەوە تەماشای مێشكی مرۆڤ بكەین، ئەوا شێوەكەی لە تۆپێكی لەت كراو یان گوێزێك دەچێت كە هەر لەتێك لە چوار پارچە پێك هاتووە: پارچەی پێشەوە، پارچەی دواوە، پارچەی لاگوێچكە ودیوارە پارچە. مێشك بە چینێكی خۆڵەمێشی داپۆشراوە پێی دەڵێن توێكڵی مێشك كە دەورێكی گرنگ لە ئەنجام دانی كردارە عەقلییە ئاست بەرزەكان دەبینێت وەك بیركردنەوە ویادكردنەوە وهتد.. توێكڵی مێشك لە سێ چین پێك هاتووە وهەڵدەستێت بە پاراستنی مێشك. خودی مێشك رەنگی سپی یە ولە چوار بەش وهەر بەشێكیش لە چەند ملیۆن نیورۆنی هەستی وجوڵەیی وگەیێنەر پێك هاتووە. بۆ نمونە نیورۆنەكانی هەستی بینین كەوتۆنەتە پشتەوەی مێشك ولە پارچەی دواوەن بەڵام ناوچەی جووڵە كەوتۆتە پێش لەتی رۆلاندۆ لە پارچەی پێشەوە، وناوچەی بیستن دەكەوێتە ژێر لەتی سلیڤۆس وناوچەی تام كردن دەكەوێتە سەرەوەی ئەو لەتە وناوچەی بۆن كردن دەكەوێتە كۆتایی (بڕوانە شێوە ٢).

---

[٢] ئەوە كێشی مێشكی پیاوە لە حاڵەتی ئاسایی، كێشی مێشكی ئافرەت ١٠٠ گرام كەمترە.




شێوە ٢: وێنەی مێشکی مرۆڤ لە تەنیشتەوە

**١. هەستی بینین:**

گرنگترین هەستە لای مرۆڤ وزیاترین هەستە کە لە ژیانی رۆژانەدا بەکار دەهێنرێت. باشە ئێمە چۆن شت دەبینین؟ روناکی دەگاتە چاو ولە رێگای بیلبیلە دەکەوێتە سەر تۆری چاو، کە لە دوو جۆرە خانە پێك هاتووە لەسەر شێوەی توول وقوچەك. هەر کە ئەو خانانە وریا دەکرێنەوە، بە هۆی روناکی، کارلێکردنێکی کیمیاوی ئالۆز روودەدات ولە شێوەی دەمارە خرپە (نبضات عـصبية) ولە رێگای نیۆرۆنەکانەوە دەگەنە ناوچەی بینین لە مێشکدا.

ئەوەی راستی بێت خانە قوچەکەکان دەورێکی گرنگیان هەیە لە بینینی رەنگەکان وجیاوازی نێوان رەنگەکان لە سێ سەرچاوەوە دێت:

یەکەم: رەنگ یان بە زمانی ئینگلیزی Hue، کە پەیوەندی بە درێژی شەپۆلەکانەوە هەیە.

دووەم: بریقەدانەوە، واتە توندی وهێزی رەنگ، کە ئەوەش پەیوەندی هەیە بە زۆر وکەمی ژمارەی شەپۆلەکان.

سێیەم: تێری، واتە رەنگ پاکی جا لە هەر ئاستێکی بریقەداری بێت وپەیوەندی بە تێکەڵ بوونی رەنگەکاندا هەیە.

## ٢. هەستی بۆن کردن:

لە رێگای کونی لووتەوە لێشاوی هەوا بۆشایی لووت (التجویف الأنفي) بڕ دەکاتەوە. دەمارە هەستی یەکان، کە تایبەتن بە بۆن کردن، لە ژوورەوەی ئەو بۆشاییەدا هەن وپەیستراون بە (البصلة الشمیة) کە دەکەوێتە مێشک، بە هۆی مووی، کورت کورت کۆتاییان هاتووە. ئینجا ئەو مووە کورتانە کە بە هۆی غازێکی خاوەن سیفەتێکی تایبەتی کاریان تێ دەکرێت، هەستە دەمارەکان وریا دەکەنەوە وپاشان ئەو کارلێککردنە بۆ مێشک دەگوازرێتەوە.

دوو بیردۆز هەن کە جیاوازی بۆن لێک دەدەنەوە. یەککەمیان لەسەر بناغەیەکی کیمیاوی دامەزراوە کە بڕوای وایە بۆن بەرهەمی شێوەی رێز بوونی گەردیلەکانە، واتە هەر بۆنێك لە رێز بوونی گەردیلەکانی شێوەیەکی تایبەتی هەیە. دووەم بیردۆز بڕوای وایە کە ئەو گەردیلانە بە هۆی جیاوازی لەرینەوەیان بۆنی جیاواز بەرهەم دێنن. دیارە ئەو بیردۆزە لەسەر بناغەیەکی فیزیایی دامەزراوە.

مرۆڤ کە تووشی هەڵامەت دێت، وا هەست دەکات کە توانای بۆن کردنی لاواز بووە هۆی ئەوەش داپۆشرانی بەشەکانی ژوورەوەی بۆشایی لووتە بە شلە، ئەوەش دەبێتە هۆی نەگەیشتنی غاز بۆ هەستە دەمارەکان. ئینجا مرۆڤ هەستی بۆن کردنی لاواز دەبێت، ولەبەر ئەوەی پەیوەندیەکی بەهێز نێوان بۆن کردن وتام کردن هەیە، مرۆڤ لەو حاڵەتەدا هەست دەکات کە توانای تام کردنیشی سست ولاواز بووە هەرچەندە ئەندامەکانی تام کردنی ساغ وسەلامەتن.

### ٣. هەستی تام کردن:

زمان، کە ئەندامی تام کردنە، بە چەندەها خانەی تایبەتی داپۆشراوە پێیان دەگوترێت خونچەکانی تام کردن، بە زمانی ئینگلیزی Taste Buds، کە بەهۆی کارتێکردنی ماددە لەگەڵیان تامی ئەو ماددەیەمان پێ دەگەیێنێت...

ئاشکرایە مرۆڤ تامی شتی شیرین وتاڵ وترش وسوور (سوێر) دەکات، وهەر یەك لەو جۆرە تامانە ناوچەیەکی نیمچە تایبەتی لە زماندا هەیە. تامی شیرینی زیاتر سەری زمان هەستی پێ دەکات هەرچی تاڵییە کۆتایی زمان هەستیارترە بۆی. تامی ترشی و سووری ئەم لاو ئەو لای زمان زیاتر هەستیان پێ دەکەن. خونچەکانی تام کردن بە داوە دەماری [illegible] ستراون کە ئەوانیش بە هەستە [illegible] ـاری ژمارە حەوتەم و نۆیەم [illegible] کە بە رێی (تالامۆس) دەگەنە مێشك.

### ٤. هەستی بەرکەوتن وهەست کردن بە پاڵەپەستۆ:

لەبەر ئەوەی زۆربەی زانایانی فسیۆلۆجیا وسایکۆلۆجیا هەست کردن بە پاڵەپەستۆ بە بەشێك یان جۆرێك لە لەبەرکەوتن دادەنێن، لێرەدا بەیەکەوە باسیان دەکەین.

بەرکەوتن هەستیارێکی زۆر گرنگە بە تایبەتی لای گیانەوەرە تاکە خانەییەکان ولای مرۆڤیش رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە کرداری خۆگونجاندن لە گەڵ سروشتدا. کۆتایی دەمارە بەرەڵڵاکان ورەگەکانی مووی پێست وخانەکانی مسنەر[٣] ئەرکی وەرگرتنی ورووژێنەرە پێستییەکانیان پێ سپێردراوە. بە هۆی ئەو هەستیارە دەتوانین خاسیەتی ئەو شتە بزانین کە بەر پێست دەکەوێت، بێ ئەوەی بیبینین، وەك نەرمی وزبری وهتد.. بەڵکو ئەو هەستە لە جێگای تاریك ولای نابینەکان جێگای بینین دەگرێتەوە وزۆر جاریش ئەو دوو هەستە پێکەوە دەکەونە کار و زیاتر دەورووبەرمان پێ دەناسێنن.

### ٥. هەست کردن بە ئازار:

هەر وروژێنەرێك ئەگەر لە پلە وشێوەی ئاسایی خۆی بەهێزتر بوو ئەوا تووشی ئازار وئێشمان دەکات وکاتێك بۆ شێوە وپلەی ئاسایی خۆی دەگەڕێتەوە، ئەوا ئازارەکە

---

[٣] زانای ئەڵمانی جۆرج مسنەر لە ساڵی ١٨٥٢ ئەو جۆرە خانانەی دۆزییەوە.

ورده ورده کەم دەبێتەوە ونامێنێت. ئەوە سەبارەت بە ئازاری پێست کە لەگەڵ ئازاری ناوەوە جیاوازە. ئازاری ناوەوەی لەش لە ئەنجامی گرژ بوونەوە ودرێژ بوونەوەی ماسولکەکان یان گرژ بوونەوەی خوێنهێنەرەکان پەیدا دەبن. بۆ نمونە سەرئێشە ئەنجامی کۆبوونەوەی خوێنە لە خوێنهێنەرەکانی ناو مێشك لە کاتی گرژ بوونەوەیان.

زانایانی فسیۆلۆجیا لەو باوەڕەدان کە ئەو دەمارە خانانەی کە کەوتوونەتە کۆتایی دەمارە بەرەڵڵاکان ئازار وێنێش، لە شێوەی دەمارە بارگە، وەردەگرن کە دەگاتە دڕکە پەت ولەوێشەوە ڕوودەکاتە مێشك وکۆئەندامی دەماری سەربەخۆ بەهەردوو بەشیەوە: سمبتاوی پاراسمبتاوی، کە دەورێکی گرنگ لەو جۆرە هەست کردنە دەگێڕێت. لە دواییدا ئەو بارگە دەمارە دەگاتە تویکڵی مێشك وزانایان وا بۆی دەچن کە مێشك بە هەموو بەشەکانی دەور دەبینێت لە هەست کردن بە ئازار.

**٦. هەست کردن بە گەرمی وساردی:**

بێگومان ئەو شتانەی دەوروبەرمان لە پلەیەکی گەرمی گۆڕاودان. بەهۆی کۆتاییەکانی دەمارە بەرەڵڵاکان هەست بە گەرمی وساردی دەکەین. وادیارە خانەکانی ڕۆفینی[٤]، کە کەوتوونەتە ژێر پێست بە قوڵایی ٣/١٠ ملیمەترە، ڕۆڵێکی سەرەکی لە هەست کردن بە گەرمی دەبینن. خانەکانی کراوس، کە کەوتونەتە ژێر پێست بە قوڵایی ١٧/١٠٠ ملیمەتر، دەورێکی گرنگ لە گواستنەوەی هەست کردن بە ساردی دەبینن[٥]. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەو دواییەدا ئەنجام دراون گومانیان خستە سەر مەسەلەی تایبەتمەندی خانەکانی ڕۆفینی و کراوس سەبارەت بە گواستنەوەی گەرمی وساردی[٦].

هەمووەمان دەزانین کە پلەی گەرمی ئاسایی لەشی مرۆڤ ٣٧ پلەی سەدییە، واتە مرۆڤ لەو پلەیەدا هەست بە گەرمی وساردی ناکات لەبەر ئەوە پێی دەڵێن پلەی سفری دەروونی. ئینجا هەر کاتێك پلەی گەرمی ئەو ورپاکەرەوەی بەر پێست

---

[٤] زانای ئیتالی ئەنجلیۆ ڕۆفینی ساڵی ١٨٩٨ ئەو جۆرە خانەی دۆزیەوە.

[٥] علم النفس الفسيولوجي، د. عمر محمد جبرين، ط١، ١٩٧٥، الجمعية العلمية الملكية، الأردن.

[٦] علم النفس الفسيولوجي، د. عزت سيد اسماعيل، ط٢، ١٩٨٢، الكويت.

دەکەوێت کە لە پلەی گەرمی لەش زیاتر بێت ئەوا هەست بە گەرمی دەکەین وبە پێچەوانەش هەست بە ساردی دەکەین چونکە پلەی گەرمی ورياكەرەوە لە هی لەش نزمترە وگەرمی لەش دەمژێت.

**٧. هەست کردن بە جوولە:**

مرۆڤ زۆربەی کات لە جوولە وبزووتنەوەدایە وهەست بە جوولەی لەشی خۆی دەکات بە هۆی ئەو ماسولکە تەشیانەی کە لە ناو ماسولکە پەیکەریەکان و جومگەکاندا هەن. خانەکانی (گۆلجی وباسینی[٧]) یارمەتی هێنانەدی ئەو هەست کردنە دەدەن. ماسولکە تەشی، کە گرنگترین ئەندامە لە هەست کردن بە جوولە، لە سێ دەمارە ریشاڵ پێك دێت، دوویان هەستە دەمارن ویەکیان جولە دەمارە. یەکێك لە هەستە دەمارە ریشاڵەکان ئەرکی گواستنەوەی زانیارییە هەستییەکانە بۆ ناوچەی هەست کردن بە جوولە لە مێشکدا. سەبارەت بە جوولانەوەی لەش، هەستە دەمارە ریشاڵەکەی تر زانیاریە هەستییەکان بۆ درکە پەت دەگوازێتەوە ولەوێشەوە بۆ مێشکۆلە بۆ ئەنجامدانی پەرچەکردارێکی جولەیی کە بە شێوەیەکی هەست پێنەکراو روودەدات.

**٨. هەست کردن بە هاوسەنگی:**

مرۆڤی ئاسایی جوولەی لەشی لەژێر کۆنترۆڵی مێشکی دایە بەڵام مرۆڤی نەخۆش وعەقل نەساغ جولانەوەی لەشی لە ژێر دەسەڵاتی مێشکی نەماوە. ئەو دیاردەبە پیاوی سەرخۆش وەی نۆشیش دەگرێتەوە کە ناتوانێت جولانەوەی لەشی کۆنترۆل وهاوسەنگ بکات.

هاوسەنگی جوولە وبزووتنەوە لەلای مرۆڤ بە هۆی جۆگەلە کەوانەییەکان، کە دەکەونە ناو گوێچکەی ناوەوە، ومێشك دێتە دی. ئەو جۆگەلانە جۆرە شلەیەکیان تێدایە کە پڕە لە هەستە مووی بچووك وبە چەند دەمارە ریشاڵێکەوە بەستراون کە ئەوانیش بە مێشکەوە بەستراون. لە کاتی جولانەوەی لەش، ئەو شلەیەش دەجولێتەوە وهەستە موەکان دەجولێن ولە ئەنجامدا کرداری کیمیاوی لەناو

---

[٧] زانای ئیتالی فیلیپۆ باسینی ئەو جۆرە خانەیەی ساڵی ١٨٣٠ دۆزیەوە.

دەمارە ریشاڵەکان دروست دەبێت ولە شێوەی دەمارە فرمان دەگاتە مێشك، ئینجا مرۆڤ دەتوانێت جولانەوەی لەشی هاوسەنگ بکات.

**٩. هەستی بیستن:**

دەنگ، لەلایەنی فیزیاویدا، بریتی بە لە چەند شەپۆلێکی دوا بەدوای یەك کە لە ئەنجامی جیاوازی پاڵەپەستۆی هەوادا پەیدا دەبێت. دەنگ لە شێوەی شەپۆلی فیزیاوی دەگاتە گوێچکە وبەناو جۆگەکەی تێدەپەرێت وپەردەی گوێ دەلەرێنێتەوە. پەردەی گوێش بە سێ ئێسقانی بچووك بەندە کە بریتین لە چەکوش وئاوزەنگی ودەزگا. بە لەرینەوەی پەردەی گوێچکە ئەو ئێسقانانەش دەلەرنەوە. شایەنی باسە ئەو ئێسقانانە بە لوولپێچ بەستراون، کە گرنگترین ئەرکی لە ئەنجامدانی کرداری بیستن وجودا کردنەوەی دەنگەکان. لوولپێچ پڕە لە شلەو مووی بچووك بچووك کە بە هۆی لەرینەوەی سێ ئێسقانەکە، ئەوانیش دەلەرنەوە ودەبنە هۆی دروست بوونی کارلێککردنی کیمیاوی لەناو دەماری بیستن کە ئەویش بۆ ناوچەی بیستن لە مێشکدا دەیگوازێتەوە لە شێوەی دەمارە فرمان.
دوو بیردۆز هەن بۆ تەفسیر کردنی چۆنیەتی جوداکردنەوەی دەنگی بەرز ونزم. یەککەمیان پێی دەگوترێت بیردۆزی دووبارەبوونەوە ودووەمیان بیردۆزی جێگایە. ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی فۆن باکسن پشتی بیردۆزی دووەمی گرت کە دەڵێت پەردەی بنکەیی لە لوولپێچ بە پێی بەرزی ونزمی دەنگ شوێنی جیاوازی دەلەرێتەوە، واتە ئەو شەپۆلانەی دووبارە بوونەوەیان بەرزە، واتە دەنگی تیژ وەك دەنگی ئافرەت، لە نزیك پەنجەرەی هێلکەی، کە دەکەوێتە سەر پەردەی بنکەیی، دەگەنە بەرزترین ئاست پاشان ون دەبن. بەڵام ئەو شەپۆلانەی کە دووبارە بوونەوەیان نزمە، وەك دەنگی پیاو، لە دووری ئەو پەنجەرەیە دەگەنە بەرزترین ئاست وپاشان ون دەبن.

هەرچەندە لەمەوپێش بە جودا باسی هەستەکانمان کرد، بەڵام ئەوەی راستی بێت کرداری هەست کردن بە شێوەیەکی گشتی وتێکرایی روو دەدات. واتە زۆربەی هەستیارەکان لە هەمان کاتدا وریادەبنەوە نەوەك هەر یەکە بە تەنیا. تۆ کە ئێستا ئەو کتێبە دەخوێنیتەوە، وەنەبێ تەنیا هەستی بینینت لەکار بێت بەڵکو

هەستەکانی تریش کاردەکەن، تۆ دەنگ دەبیستیت وهەست بەساردی یان گەرمی شوێنەکەت دەکەیت وهتد.. کەواتە زۆربەی هەستیارەکانت وریان نەک تەنیا هەستی بینین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیرت لای ئەو شتانەیە کە بەر چاوت دەکەون وهەوڵ دەدەیت تێیان دەگەیت. مێشکی مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە کە لە سەرجەمی ئەو وریاکەرەوانەی کاری تێ دەکەن وەڵامی هەندێکیان بداتەوە و هەندێکی تریان فەرامۆش بکات، ئەوەش بە هۆی کردارێك کە لە بواری دەروونزانی پێی دەگوترێت ئاگاداری..

**خۆت تاقی بکەرەوە؟**

١. ئەو مەرجانە چین کە پێویستە هەبن بۆ ئەوەی هەست بە شتێك بکەیت؟
٢. خانە قووچەکەکان چ ڕۆڵێکیان هەیە لە کرداری بینین؟
٣. ئەو خانانە چین کە یارمەتیمان دەدەن هەست بە گەرمی وساردی بکەین؟
٤. چۆن هەستی هاوسەنگی وجووڵە لای مرۆڤ دێتەدی؟
٥. ئەو بیردۆزانە چین کە تەفسیر دیاردەی جوداکردنەوەی دەنگەکان دەکەن؟

# ئاگاداری

## پێناسەی ئاگاداری:

مێلڤن مارکس دەڵێت: "ئاگاداری چەمکێکی فرەوانە، مانای هۆش ڕوونییە، Clarity of Consciousness، مانای ئامادەبوونی زیندەوەرە بۆ (ترکیز) کردن لەسەر هەستێك یان لایەنێکی ئەو هەستە ولەوانەیە مانای لە بێزینگ دانی نێردراوی هەستیەکان بدات، وەیان مانای توانای بزوتنەوە وجوولانەوە بێت کە کرداری وەلامدانەوە یان بەرتەك (پەرچەکردار) ئاسان دەکات"[1]. بە پێی مون وهاورێکانی، ئاگاداری بریتی لە ئامادەبوون بۆ زانین یان پێش زانین یان پێش بینین، کە لەسەر بناغەی ئارەزووی تاکەکەس وبالنەرەکانی لەلایەك و سروشتی وریاکەرەوەکە لەلایەکی دیکەوە دامەزراوە[2].

زۆر جار ئاگاداری وا پێناسە دەکرێت کە بریتییە لەوەی کە شتێك بخەیتە ناو چەقی نەست (شعور) یان هۆش (وعی) وئەو شتانەی کە مرۆڤ ئاگای لێیان نییە کەوتوونەتە پەراوێزی هۆش. واتە لەو کاتەی تۆ کە ئەو کتێبە دەخوێنیتەوە، وشە چاپکراوەکانی سەر کاغەز دەکەونە چەقی هۆشت ودەنگ وبۆن وگەرمی وهتد.. دەکەونە پەراوێزی هۆش. وە ئەگەر لە ڕوانگەیەکی سایکۆفسیۆلۆجیەوە پێناسەی ئاگاداری بکەین دەتوانین بڵێین کە بریتییە لە کۆکردنەوەی زۆریەی وزە کەمرۆکیمیاویەکانی مێشك لە ناوچەیەکی دیاریکراو تیایدا، ئینجا چ ناوچەی هەست کردن بێت یان ناوچەی کردارە دەروونی وعەقلییە بالاکان. ئەوەش یارمەتی مرۆڤ دەدات کە بە شێوەیەکی وردتر وچاکتر ئەو وریاکەرەوانە بناسێت کە کەوتوونەتە ناو بواری ئەو ناوچەیە وبتوانێت بە شێوەیەکی ڕاست وورد مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، واتە وەلامیان بداتەوە.

## چەشنەکانی ئاگاداری:

لە ڕوانگەی ویستی مرۆڤەوە، دەتوانین ئاگاداری بکەین بە دوو چەشن:

---

[1] Marx, Melvin H., *Introduction to Psychology*. New York: Macmillan P.C., ١٩٧٦, p.١٣٨.

[2] Munn et al., *Introduction to Psychology*. New Delhi: Oxford & IBH Pu. Co. ١٩٦٦.

١. ئاگاداری ویستراو: کاتێك مرۆڤ دەیەوێت ئاگاداری ورياکەرەوەیەکی دیاریکراو بێت، بۆ هەر مەبەستێك، ئەوەش چ بریتی بێت لە ورد بوونەوە لە تابلۆیەکی هونەری یان خوێندنەوەی کتێبێك وهتد...، ئەو جۆر ئاگادارییە ویستراوە. ئەو چەشنە ئاگادارییە مرۆڤ ماندوو دەکات چونکە پێویستی بە وزە وتوانایەکی تایبەتی هەیە، هەر لەبەر ئەوەیە کە هەست بە ماندوو بوون دەکەیت پاش تەواو بوونی موحازەرەیەکی بەپێز وسەرنج راکێش. هەر ئەو هۆیەشە وا لە منداڵان دەکات کە نەتوانن بۆ ماوەیەکی زۆر ئاگاداری ورياکەرەوەیەك بن.

٢. ئاگاداری نەویستراو: لەو کاتەی کە ورياکەرەوەیەك لە ئاست وپلەی سروشتی یان ئاسایی خۆی زیاتر دەبێت، ئەوا سەرنجی مرۆڤ کێش دەکات بۆ لای خۆی، واتە ئەو جۆرە ئاگادارییە لەژێر کۆنترۆلی مرۆڤ بەدەرە. بۆ نمونە ئەگەر لەکاتی خوێندنەوەی ئەو کتێبە قیژەی ئافرەتێك ببیستیت، ئەوا بەبێ ویست ومەبەست، ئەو دەنگە سەرنجت رادەکێشێت وئاگاداری دەبیت. بە شێوەیەکی گشتی ئەو جۆرە ئاگادارییە ماوەیەکی زۆر ناخایەنێت وکورت تەمەنە.

دەتوانین باسی چەشنێکی تری ئاگاداری بکەین کە پێویستی بە توانا و وزەیەکی زۆر نییە وگواستنەوەی ئاگاداری لە ورياکەرەوەیەك بۆ ورياکەرەوەیەکی تر ئاسانە، کە دەتوانرێت پێی بگوترێت ئاگاداری سروشتی یان ئاسایی. لە ڕاستییدا ئێمە زۆربەی کاتمان بەو جۆرە ئاگادارییە بەسەر دەبەین وەك بینینی کەسان وشت ومەك لە بازاڕدا. ئەو جۆرە ئاگادارییە، کە سادەترین شێوەیە، نزیکە لە دیاردەی هەست کردن ومرۆڤ ناتوانێت بە هۆیەوە لایەنە هورد وشاردراوەکانی ورياکەرەوەکە بدۆزێتەوە.

پەیوەندی نێوان ئاگاداری وتێبینی کردن وەك پەیوەندی گشتە بە بەش، واتە دەتوانین بڵێین تێبینی بەشێکە لە ئاگاداری، بە تایبەتی ئەو ئاگادارییەی کە پشت بە بینین دەبەستێت، بۆ نمونە دەڵێین تێبینی ئەو شتە بکە ونالێین تێبینی ئەو دەنگە بکە. لە راستییدا وشەی (تێبینی) لە دوو برگە پێك هاتووە: (تێ) و (بینی) واتە بینین دەورێکی سەرەکی دەگێڕێت لەو کردارە بەڵام نەك بینینێکی ئاسایی بەڵکو بینینێکی ورد وروون.

**هۆیەکانی ئاگاداری:**

هۆی چییە کە ئێمە ئاگاداری وریاکەرەوەیەك دەبین بەلام وریاکەرەوەکانی تر فەرامۆش دەکەین؟ بە کورتی، هەر وریاکەرەوەیەك لامان گرنگ وبەهادار بێت ئەوا بایەخی پێ دەدەین وئاگاداری دەبین وپێچەوانەی ئەوەش ڕاستە.

دیارە دوو جۆر هۆ هەن کە یەکەمیان تایبەتە بە سروشتی وریاکەرەوەکە، واتە مەوزوعییە، ودووەمیان بە باری دەروونی وعەقلی مرۆڤەوە بەندە (واتە زاتییە)، بەلام جودا کردنەوەی ئەو هۆیانە ئەستەمە بۆیە لێرەدا بە گشتی باسیان دەکەین:

١. نوێیتی: هەرچەند وریاکەرەوە نامۆ وتازە ونوێ بێت، یاخود بۆ یەکەم جار هەستی پێ بکەین، سەرنج ڕاکێشەرتر دەبێت وپێچەوانەش ڕاستە. بۆ نمونە کابرایەکی نامۆی نەناسراو لە کۆڵانەکەتان بسوورێتەوە زیاتر سەرنجت ڕادەکێشێت لەو منداڵەی کۆڵان کە لەوانەیە دەیەها جار بینیوتە، یان کە سەر لە کتێبخانەیەك بدەیت کتێبە کۆنەکان سەرنجت ڕاناکێشن بەڵکو بە پەلە چاوێکیان پێدا دەخشێنیت بەلام ئەگەر کتێبێکی تازە هاتبێت ئەوا یەکسەر چاوت لەسەری دەوەستێت وسەرنجت ڕادەکێشێت، ونمونەی تریش زۆر هەن لە ژیانی ڕۆژانەماندا.

٢. هێز: ئەگەر وریاکەرەوە لە ئاست وپلەی ئاسایی خۆی بەهێزتر بوو، ئەوا سەرنجمان ڕادەکێشێت وئاگادارمان دەکاتەوە. بۆ نمونە ئەگەر لە کتێبخانەی گشتی خەریکی خوێندنەوە بیت ودوو کەس لە نزیکت بە دەنگێکی نزم قسە بکەن، لەوانەیە ئاگادار نەبیت بەلام ئەگەر یەکێکیان دەنگی لە پلەی ئاسایی زیاتر بەرز کردەوە، ئەوا بێگومان ئاگادار دەبیتەوە وبۆ ماوەیەك چاوت لەسەر کتێبەکە لا دەدەیت..

٣. دووبارە بوونەوە: دووبارە بوونەوەی وریاکەرەوەیەك لەوانەیە سەرنجی مرۆڤ ڕابکێشێت ولەوانەشە بێزاری بکات وجیاوازیەکی ڕێژەیی هەیە لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا. واتە لەوانەیە دووبارە بوونەوە لە پلە وئاست وڕادەیەك سەرنج ڕاکێشەر وئاگادارکەرەوە بێت بەلام ئەگەر بەردەوام بوو ئەوا دەبێتە مایەی بێزار بوون. بۆ نمونە ئەگەر بە شەو تەنها جارێك گوێت لە دەنگێکی نائاسایی

بێت، وەك کەوتنی بەردێك، لەوانەیە ئەو دەنگە سەرنجت رانەکێشێت، بەڵام کە دووبارەو سێبارە بۆوە، ئینجا ئاگادار دەبیتەوە.

**خۆت تاقی بکەوە!**

**١. ئاگاداری چۆن پێناسە دەکرێت؟**

**٢. چەشنەکانی ئاگاداری چین؟**

**٣. ئەو هۆیانە چین کە وامان لێدەکەن ئاگاداری وریاکەرەوەیەکی دیاریکراو ببین؟**

# زانین

کە گۆڕانێك چ لە ژینگەی دەرەوە یان ناوەوەمان ڕوو دەدات، ئەوا هەستی پێ دەکەین. بەڵام ئەو هەست کردنە خۆی لە خۆی هیچ سوودێکی نییە ئەگەر توانای ئەوەمان نەبێت کە لێکیبدەینەوە. لێکدانەوەی هەستەکان بریتی لە زانین کە بە شێوەیەکی گشتی لە دوای هەست کردن دێت. هەرچەندە جۆرە زانینێك هەیە کە ڕوودەدات بێ ئەوەی بە هەستدا تێپەڕێت کە پێی دەگوترێت: زانین سەرەوەی هەست (الادراك فوق الحسي)، وەك دایکێك (دەزانێت) کە کوڕەکەی یان کچەکەی، کە لە شارێکی تر دەژیێت، نەخۆش کەوتووە، بێ ئەوەی کەس ئەو هەواڵەی بە دایکەکە گەیاندبێت. دیارە ئەو جۆرە دیاردەیە دەکەوێتە ... پەیوەی پاراسایکۆلۆجی وبابەتی ئێمە نییە لێرەدا.

لیندا دافیدۆف زانین بەو شێوەیە پێناسە دەکات کە بریتییە لە تەفسیر کردنی ئەو زانیاریانەی لە ڕێگای ئەندامەکانی هەستەوە دەگەنە مێشك، یان بریتییە لە پرۆسەی ڕێکخستن وتەفسیر کردنی دراوە هەستیەکان (واتە المعطیات الحسیة)[1]. واتە ئەگەر هێلکاریەك بۆ پەیوەندی نێوان هەست کردن وئاگاداری وزانین بکێشین لەوانەیە بەو شێوەی خوارەوە بێت:

هەست کردن ⇐ ئاگاداری ⇐ زانین

ئەوەی ڕاستی بێت دەروونزانەکانی سەر بە قوتابخانەی گشتاڵت زیاتر لە هەموو دەروونزانەکانی تر بایەخیان بە پرۆسەی زانین دا و بیر بۆچوونەکانیان هەتا ئیستاش لەو بوارەدا وەردەگیرێت ودەخوێنرێت، بە تایبەتی ماکس ڤێرتهێیمەر. پاش ئەوەی زانیمان زانین چییە، با بپرسین چۆن پرۆسەی زانین ڕوو دەدات؟

**بنەماکانی زانین:**

مرۆڤ کۆمەڵە ستراتیژیەتێك بەکار دێنێت لە کاتی ئەنجام دانی پرۆسەی زانین. لێرەدا باس لەو جۆرە زانینە دەکەین کە لەسەر بناغەی بینین دامەزراوە (وانە

---

[1] لیندا ل. دفیدوف، مدخل علم النفس، ترجمة: د. سید الطواب، د. محمود عمر، د. نجیب خزام (نیویورك: دار ماکجروهیل للنشر، ط٤، ١٩٨٣) ص: ٢٤٦.

الإدراك البـــصري) ئـەوەش لەبـەر ئـەوەی ئـەو جـۆرە زانینـە لـە لایـەك گـرنگترین سەرچاوەی زانینە کە مرۆڤ پشتی پێ دەبەستێ، ولە لایەکی ترەوە، زیاترین جۆرە کـە تـاقی کردنـەوەی زۆری لەسـەر ئـەنجام دراوە و ڕاسـتی زۆر دەربـارەی کـۆ کراوەتەوە. لە خوارەوە بە کورتی باسی بنەماکانی زانین دەکەین.

١.جـێگیری: واتـە ئەگـەر لـە گۆشـە ودووری وبـارودۆخی جیـاواز تەماشـای شـتە بینراوەکان بکەین، زانینمـان بـۆ شـێوە وقـەبارە ورەنگـی شـتەکان وەك خۆیـان دەمێننەوە، واتە جێگیرن وناگۆڕین. کە کەسێك لێمان دوور دەکەوێتەوە، وێنـەی ئەو کەسە لەسەر تۆڕی چاو بچووك دەبێتەوە، بەڵام ئێمە دەزانین کە ئەو کەسـە بچووك نەبۆتەوە وقەبارەکەی وەك خۆیەتی.

٢.شێوە وزەمینە: هیچ شـێوەیەك بـەبێ زەمینـە دەرك ناکرێـت، ئەگـەر شـێوە لـە زەمینەکەی جودا بکەینەوە یان بیانکەین بە یەك، ئەوا ناتوانین پەی پـێ ببـەین. بە ڕای دافیدۆف، ئەو جـۆرە توانایـە زگماکـە ولـە ژینگـەوە فێـری نـەبووین. بـۆ نمونـە بڕوانـە شـێوە ٤ و ٥. دەکـرێ شـێوە ٤ وەك مـەرکانێك یـان دوو ڕووی بەرامبەر بەیەك دەرك بکەین. ئەوەش بەندە بـەوەی ئێمـە کـام بـەش بـە شـێوە وکام بەش بە زەمینە دادەنێین. لە ڕاستیدا چاومان بـە نـۆرە شـێوە وزەمینەکـە ئاڵوگۆڕ دەکات. لە شێوەی پێنج دەتوانین شێوەی پیرەژنێك بـەدی بکـەین یـان شێوەی کچێکی گەنج، بەندە بەوەی کامیان شێوەیە وکامیان زەمینە.



شێوە ٤: شێوەی مەرکان دەبینیت یان شێوەی دوو رووی بەرامبەر یەکتر؟



شێوە ٥: وێنەی پیرەژنێک دەبینیت یان کچێکی گەنج؟

٣. رێکخستن: رێکخستنی وریاکەرەوە دەرەکیەکان لەرێگای چەند بنەمایەک دێتەدی، گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

أ. لێکچوون: واتە ئەو شتانەی کە لە شێوە یان رەنگ لەیەک دەچن ئەوا مرۆڤ وەک یەکەیەک پەیان پێ دەبات. بۆ نمونە ئەو شێوانەی خوارەوە وەک ستونێک لە چوارگۆشە وستونێک لە بازنە دەرک دەکرێن نەک وەک ریزێک لە چوارگۆشە وبازنە.



شێوە: ٢: ئەو شێوانەی خوارەوە وەک چەند ستونێک دەرک دەکرێن نەک وەک چەند ریزێک.

ب. نزیکی: ئەو شتانەی کە لەلایەنی کات یان شوێن لە یەك نزیکن، وەك یەك یەکە دەرك دەکرێن. بۆ نمونە ئەو شێوەی خوارەوە لەبەر ئەوەی چوارگۆشەکانی (أ) بەشێوەیەکی ئاسۆیی لە یەکتری نزیکن وەك ریز دەرکیان دەکەین، بەڵام شێوەی (ب) وەك سێ ستوون دەرك دەکەین چونکە چوارگۆشەکان بە شێوەیەکی ستوونی لە یەك نزیکن.



أ



ب

شێوە ٤: سێ ریز چوارگۆشە وسێ ستوونی چوارگۆشە.

ج. هاوشێوەیی: واتە ئێمە هەوڵ دەدەین هاوشێوەیی لە شتەکان بەدی بکەین. بۆ نمونە: ئەو شێوەی خوارەوە وەك دوو چوارگۆشە (أ و ب) دەرك دەکرێن نەك وەك دوو سێ شێوەی جودا (واتە شێوەی أ بەبێ چوارگۆشەی ج، وشێوەی ب بەبێ چوارگۆشەی ج، وچوارگۆشەی ج بەتەنها).




شێوە ٥: دوو چوارگۆشە دەبینیت یان سێ شێوەی جودا؟

د. بەردەوامی: لە کاتی بینینی شتەکان، ئێمە هەوڵ دەدەین بەردەوامی بەدی بکەین بۆ نمونە ئەگەر تەماشای شێوە ٦ بکەین، وادەزانین کە ئەو منداڵەی لای خاڵی A یە لە خاڵی ژمارە ٢ دەستی بە یاری کردووە ومنداڵەکەی لای خاڵی B لە خاڵی ژمارە ١ دەستی پێکردووە، واتە ئێمە وادەزانین کە هەردوو منداڵەکە لەسەر یەك هێل بەردەوام بوون، هەرچەندە دوور نییە کە منداڵەکەی خاڵی A لە خاڵی ١ دەستی بە یاری کردبێت ومنداڵی لای خاڵی B لە خاڵی ٢ دەستی پێکردبێت ولە ناوەڕاستدا ئاراستەیان گۆڕیبێت؟




شێوە ٦: ئەو دوو منداڵە لە چ خاڵێکەوە دەستیان بە یاری کردووە؟

هـ . داخستن: واتە ئێمە کە وریاکەرەوەیەکی ناتەواو دەبینین، هەوڵ دەدەین کە ناتەواویەکەی تەواو بکەین. بۆ نمونە زۆر جار ڕوو دەدات کە لە کاتی خوێندنەوە یەکەم جار هەست بە هەڵەی چاپ ناکەین چونکە مێشکمان لە یەکەم جاردا هەڵەکە ڕاست دەکاتەوە، پاشان ئەگەر بە وردتر تێبینی بکەین ئەوا هەڵەکە دەبینین. هەروەها لە کاتی بینینی وێنە هەوڵ دەدەین بۆشایەکان پڕ بکەینەوە، یان وێنەکە دابخەین، بۆ ئەوەی وێنەیەکی تەواو ببینین، تەماشای شێوە ٧ بکە. ئەو شێوە وا دەرك دەکەین کە شێوەی بازنەیە وبەڵام لە ڕاستیدا بۆشایی نێوان هێلەکە هەیە بەڵام مێشکی مرۆڤ بۆشایەکان پڕ دەکاتەوە وشێوەکە وەك بازنە دەبینێت نەك وەك کۆمەڵە هێلێکی کورت و کۆمەڵە خاڵێك.



شێوە ٧: کۆمەڵە هێڵێکی کورت وکۆمەڵە خاڵێك یان بازنەیەك دەبینیت؟

**ئەو هۆکارانەی کار لە زانین دەکەن:**

هەرچەندە ئێمە بە شێوەیەکی گشتی دەرك بە شتەکان دەکەین بەو شێوەیەی کە لە واقیعدا هەن، کۆمەڵێك هۆکار هەن کە وا دەکەن زانینی شتەکانمان لا بگۆڕدرێت. لە خوارەوە باسی هەندێك لەو فاکتەرە گرنگانە دەکەین[٢]:

١. ئاشنا بوون: مەبەست لەو فاکتەرە ئەوەیە کە ئێمە بە شێوەیەکی ئاسانترو خێراتر دەرك بەو شتانە دەکەین کە پێیان ئاشناین نەك ئەو شتانەی کە تازەن. بۆ نمونە چونکە ئێمە ئاشاناین بەو کەل وپەلانەی کە لە ماڵەکانمان هەن، بە ئاسانی دەیاندۆزینەوە، بەڵام لە ماڵی خەڵکی تر دۆزینەوەی کەل وپەل گرانترە وکاتێکی زیاتر دەوێ. لە یەکێك لە تاقیکردنەوەکان داوا لە کۆمەڵێك مندالّ کرا کە وێنەی درهەمێك بکەن، ئەو منداڵانەی لە چینی دەوڵەمەند هاتبوون بە شێوەیەکی چاکتر وێنەکەیان کرد لەو منداڵانەی کە لە چینی هەژاردا هاتبوون، واتە وێنەکەی منداڵە دەوڵەمەندەکان نزیکتر بوون لە واقیع وئەو وێنەی کە منداڵە هەژارەکان کێشابوویان بۆ هەمان درهەم گەورەتر بوو. ئەوەش دەتوانرێت بە فاکتەری ئاشنا بوون لێك بدرێتەوە. واتە چونکە منداڵە دەوڵەمەندەکان ئاشناترن بە پارە، بەتواناترن لە کێشانی وێنەیەکی نزیك لە واقیع بۆ ئەو پارەیە.

٢. سادەیی وئاشکرایی: واتە ئەو ورپاکەرەوانەی کە چەند خاسیەتێکی تایبەتیان هەیە وەك ئاشکرایی وسادەیی ولەیەك نزیکی، ئاسانتر دەرکیان پێ دەکرێت

[٢] بڕوانە: علم النفس المعرفي، د. رافع النصير الزغلول ود. عماد عبد الرحيم الزغلول، دار الشروق: عمان، ٢٠٠٣.

ئەگەر بەراورد بکرێن بە وریاکەرەوە نادیارەکان. بۆ نمونە: ئاسانتر ئەنجامی ١٠-٥= دەدۆزینەوە لە ئەنجامی ١١٠٠-٥٥٠= ، چونکە یەکەمیان سادەیە وئاشکرایە بەڵام دووەمیان نادیارە وزەحمەتە وپێویستی بە کات وهەوڵێکی زیاتر هەیە.

٣. چاوەڕوانی: ئەو شتەی مرۆڤ چاوەڕوانی دەکات کار لە چۆنیەتی دەرك کردنی شتەکانی دەکات. واتە ئەگەر تۆ چاوەڕوانی هاوڕێیەکت بکەیت لە ژوورێك، ئەوا هەر جارێك دەگای ژوورەکە دەکرێتەوە وادەزانیت ئەوە هاوڕێیەکەتە، کە لەوانەشە ئەو نەبێت!

٤. پاڵنەر: پێویستی وپاڵنەرەکانی مرۆڤ کار لە چۆنیەتی دەرك کردنی دەوروبەرمان دەکەن. واتە ئێمە زۆر لە وریاکەرەوە ورووداوەکان بە شێوەیەکی وا لێکدەدەینەوە کە لەگەڵ پێویستیەکانمان بگونجێت. بۆ نمونە ئەو کەسەی برسی بێت، ئەوا ئەگەر بۆنێکی نادیار بکات ئەوا وادەزانێت بۆنی خواردنە، یان ئەگەر شێوەیەکی یان وێنەیەکی نادیاری پێ نیشان بدرێت، وا دەزانێت ئەوە وێنەی خواردنە!

٥. حالەتی ئینفیعالی: ئەو حالەتە ئینفیعالیانەی کە مرۆڤ تووشیان دێت، وەك دڵەراوکێ وتووڕەیی وترس وخەم وخۆشی وهتد.. کار لە پرۆسەی زانین دەکەن. شتێکی ئاشکرایە کاتێك کە تووڕە دەبین ئەوا هەوڵ دەدەین شتەکانی دەوروبەرمان، بۆ نمونە قسەی هاوڕێیەك، بە شێوەیەکی جیاواز لێکبدەینەوە. لەوانەیە بزەی سەر لێوی بەرامبەر لە کاتی حالەتی دەروون ئارامیمان بە شتێکی باش لێکدەدەینەوە بەڵام هەمان بزە بە شێوەیەکی خراپ لێکدەدەینەوە، وەك ئیشارەتێك بۆ گاڵتە پێکردن، ئەگەر حالەتی تووڕەبوون دابین.

٦. پیشە: دیارە کەسێك کە پیشەیەکی دیاریکراو دەکات، ئاشناتر دەبێت بەو وریاکەرەوانەی کە پەیوەندیان بە پیشەکەی هەیە. ئەگەر گوێت لە دەنگێك بێت لە مەکینەی ئۆتۆمبیلەکەت، لەوانەیە هۆیەکەی نەزانیت، بەڵام ئەگەر فیتەرێکی باش بیت، ئەوا بێگومان دەزانیت ئەو دەنگە هۆیەکەی چییە؟

٧. بەها: ئەو بەها وبیروباوەڕانەی کە هەمانە کار لە پرۆسەی دەرك پێکردنی شتەکان دەکەن. واتە لە کاتی لێکدانەوەی شتەکان یان ڕووداوەکان لە دەوروبەرمان، هەوڵ دەدەین بە شێوەیەکی وەها لێکیان بدەینەوە کە لەگەڵ بەها وبیروباوەڕەکانی پێشترمان ڕێك بن وبگونجێن. بۆ نمونە ئەگەر لە ڕۆژی مردنێکی پیاوێکی چینی باران ببارێت، ئەوا خەڵك دەڵێن ئەو پیاوە پیاوێکی چاك بووە. واتە دیاردەی باران بارین وا لێکدەدەنەوە کە ببێتە بەڵگە لەسەر چاکی بابای مردوو.

٨. ئارەزوو: مرۆڤ حەز دەکات شتەکان دەرك بکات بە شێوەیەك کە لەگەڵ ئارەزوو وحەزەکان بگونجێت ئەوەش دیاردەی لایەنی (تحیز) ڕوون دەکاتەوە. بۆ نمونە ئەگەر ئێمە کەسێکمان خۆش بوێت، ئەوا زۆربەی جار لایەنە خراپەکانی ئەو کەسە نابینین بەڵام ئەگەر ڕقمان لە کەسێك بێتەوە، بە پێچەوانەوە، هیچ لایەنێکی باشی تیادا نابینین وئەگەر بشیبینین ودانی پێدابنێین ئەوا یان بە کەمی دەزانین ویان دەڵێن ئیشەکە باش بوو بەڵام نیەت ونیازی کابرا خراپ بوو!

٩. ئاستی ئاگاداری: ئەگەر ئاستی ئاگاداریمان بەرز بێت، ئەوا شتەکان باشتر دەرك پێدەکەین وپێچەوانەش ڕاستە. ئەگەر فێرخواز ئاگاداری قسە مامۆستا بێت، ئەوا چاکتر دەزانێت مامۆستا چی دەڵێت لەو فێرخوازە کە خەریکی قسە کردنە لەگەڵ برادەرەکەی یان دالفەی لێداوە ولە دەریای خەیاڵ نوقم بووە!

**خۆت تاقی بکەوە!**

١. چۆن دافیدۆف پرۆسەی زانین پێناسە دەکات؟
٢. بنەماکانی زانین چین؟
٣. ڕێکخستنی وریاکەرەوە دەرەکییەکان لەسەر چەند بنەمایەك دێتە دی. ئەو بنەمایانە چین؟
٤. ئەو فاکتەرانە چین کە کار لە پرۆسەی زانین دەکەن؟

# بەبیرهاتنەوە ولەبیرچوون

دیارە ئەو شتانەی کە لە ژیانی رۆژانەماندا تووشیان دێین هەندێکیان لە بیرمان دەمێنن وهەندێکی تریان لەبیردەکەین. گرنگی بەبیرهاتنەوە لەوەدایە کە بناغەی پرۆسەی فێربوونە واتە ئەگەر ئێمە توانای بەبیرهاتنەوەمان نەبێت، ئەوا توانای فێربوونی هیچ شتێکمان نابێت. لەو بەشە یەکەمجار باسی پرۆسەی بەبیرهاتنەوە دەکەین وپاشانیش دێینە سەر باسی لەبیرچوونەوە.

## بەبیرهاتنەوە

بەبیرهاتنەوە بریتییە لە زنجیرە کردارێکی عەقلی کە پەیوەندی بە هەلگرتن ودووبارە هێنانەوەی زانیاری هەیە ، یاخود ئەو پرۆسە عەقلییەیە کە هەڵدەستێت بە تۆمارکردن وهەلگرتن وهێنانەوەی بیرەوەری چ لە شێوەی زانیاری، یان بیرۆکە، یان رەفتار، یان ئارەزوو بێت. هەروەها دەتوانرێت "بەبیرهاتنەوە بە گشت پرۆسە مەعریفیەکان دابنرێت کە بە وەرگرتنی زانیاری دەست پێدەکات وبە هێمابۆدانان وهەلگرتن تێدەپەرێت وبە پرۆسەی گێرانەوەی زانیاریەکە لە کاتی پێویستدا کۆتایی دێت"[1].

### بیردۆزەکانی بەبیرهاتنەوە

دەکرێ ئەو بیردۆزانەی کە هەوڵ دەدەن چۆنیەتی بەبیرهاتنەوە لێکبدەنەوە بۆ دوو کۆمەڵە دابەش بکرێن: بیردۆزە فسیۆلۆجیەکان وبیردۆزە مەعریفیەکان.

### یەکەم: بیردۆزە فسیۆلۆجیەکان

ئەو جۆرە بیردۆزانە جەخت لەسەر رۆلی مێشك ومادەی کیمیاوی ناو خانەکان دەکەن. دیارە ئەو جۆرە بیردۆزانە پاش پێشکەوتنی تەکنۆلۆجی ئامێرەکانی پشکنینی مێشك هاتنەکایەوە. ئەو جۆرە بیردۆزانە، هەرچەندە لەژێر یەك چەتر دانراون، جیاوازیان لەگەڵ یەکتر هەیە. لە خوارەوە زۆر بەکورتی باسی چەند بیردۆزێکی گرنگی فسیۆلۆجی دەکەین.

---

[1] عدنان يوسف العتوم، علم النفس المعرفي: النظرية والتطبيق (عمان: دار المسيرة، ٢٠٠٤) ص: ١١٨.

١. **بیردۆزی تەشریحی:** بە پێی ئەو بیردۆزە، جێگیربوون ومانەوەی بیرەوەریەکان لە مێشك دەبێتە هۆی هێنانە کایەوەی چەند گۆڕانێکی تەشریحی وبونیادی، واتە گۆڕان لە خودی دروست بوون وپێکهاتەی کۆتایی نیۆرۆنەکان (دەمارە خانەکان)، یان لە تۆڕەکانی کۆئەندامی دەمار. ئەو کردارەش بە چەند ڕێگایەك ئەنجام دەدرێت:

- لە ڕێگای زیادبوونی گرێ تۆڕەکان لەلایەن ژمارەیان یان قەبارەیان.
- لە ڕێگای گۆڕانی پێکهاتەی کیمیاوی ئەو گرێ تۆڕانە.

ئەوەش لەوانەیە ببێتە هۆی زیاد بوونی توانای ئەو تۆڕانە بۆ وروژاندن وئاسان کردنی تێپەڕینی دەمارە ئیشارەتەکان، ئەوەش بەش بە حاڵی خۆی دەبێتە هۆی ئاسانی ئەکتیف کردنی ئەو ڕێگا دەمارە تایبەتیانەی کە هەڵدەستن بە گواستنەوەی ئیشارەتەکانی بەبیرهاتنەوەی ئەو بیرۆکانەی کە بەو ڕێگایەدا دەگوازرێنەوە.

٢. **بیردۆزی بازنەی دەمارەخانە** Neuronal Circuits Theory

بەپێی ئەو بیردۆزە ئەو کاریگەریانەی کە لە ئەنجامی وروژاندنی ئەندامانی هەست پەیدا دەبن، شێوەیەك لە لێدانی دەماری (واتە نبضات عـصبية) بەرهەم دێنن لە دەمارە بازنەکان، کە لە چەند دەمارە خانەیەك پێکهاتووە. دەمارە بازنەکان ئەو شێوە لێدانە دەماریە بۆ ماوەیەکی درێژ هەڵدەگرن وهەرکاتێك ئەو دەمارە بازنانە وروژێنران بەهۆی ورپاکەرەوەیەك کە پەیوەندی هەبێت بەو بیرۆکەیەی کە هەڵگیراوە، ئەوا چالاکی ئەو دەمارە بازنانە زیاد دەبێت تا دەگاتە ناوچەکانی توێکڵی مێشك ودەگاتە ئاستی بەئاگابوون (وعی) وبەو جۆرە کەسەکە ئەو بیرۆکەیەی دێتەوە یاد.

٣. **بیردۆزی کیمیاوی**

بیرەوەریەکان، بەپێی ئەو بیردۆزە، لە کۆئەندامی دەمار هەڵدەگیرێن لەشێوەی گۆڕانی زیندەکیمیاوی ناو دەمارە خانەکان. ترشی رایبۆی ناوکی Ribonucleic Acid یان بەکورتی RNA هەڵدەستێت بە هەڵگرتنی بیرەوەریە تایبەتیەکان لەسەر شێوەی کۆدی کیمیاوی تیایدا یان لەو مادە پرۆتینیانەی کە بەرهەمیان دێنێت.

چەندەها ئەزموون لەسەر کرمی یان وەشك ئەنجامدرا بۆ پاڵپشتی کردن لەو بیردۆزە[٢].

٤. **بیردۆزی بۆشایی نێوان دەمارەخانەکان** Synapses Theory

باوترین بیردۆز لە بواری بەبیرهاتنەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پرۆسەی هەڵگرتن، واتە هەڵگرتنی بیرەوەرییەکان، لەو بۆشاییە زۆر بچووکانە ئەنجام دەدرێت کە دەکەونە نێوان دەمارەخانەکان یان نیۆرۆنەکان کە پێیان دەگوترێت Synapses، چونکە دەمارە خانەکان بە یەکتر نەبەستراون بەڵکو بۆشاییەکی زۆر بچووك، کە بێگومان بە چاو نابینرێت، لە نێوانیاندا هەیە. ئەو گۆڕانە کیمیاویانەی کە لەو بۆشاییانە ڕوو دەدەن ڕێگا دەدات کە تەزووی کارەۆکیمیاوی لە دەمارەخانەیەکەوە بۆ دەمارە خانەیەکی تر بگوازرێتەوە. کەواتە ئەو بۆشاییانە ڕۆڵی سویچی کارەبا دەبینن وهەندێك لە زانایان وای بۆ دەچن کە بۆشایی نێوان دەمارەخانەکان ئەو جێگایە بێت کە زانیاری تێدا هەڵدەگیرێت بە هۆی ڕێگادان یان ڕێگا گرتن لە تەزووی کارەۆکیمیاوی، ئەوەش وەك چۆنیەتی هەڵگرتنی زانیاریە لە ناو کۆمپیوتەردا.

**دووەم: بیردۆزە مەعریفیەکان**

ئەو بیردۆزانە تەماشای بەبیرهاتنەوە دەکەن وەك چەمك، یان دروستکراوێکی گریمانی، واتە ئێمە وادەدەنێین (گریمان) کە شتێك یان کردارێك هەیە هەرچەندە هەستی پێ ناکرێت، وەك چەمکی فێربوون وپاڵنەر وبیرکردنەوە وبەبیرهاتنەوە. چەند مۆدێلێك پێشنیارکراون بۆ لێکدانەوەی پرۆسەی بەبیرهاتنەوە لە ڕوانگەی مەعریفیەوە وەك مۆدێلی ئەتکنسن وشفرین، ومۆدێلی ۆف ونۆرمان، ومۆدێلی شەلیس و ورانگتن ومۆدێلی برۆدبێنت وهتد.. لێرەدا تەنها باسی مۆدێلی ئەتکنسن وشفرین دەکەین کە یەکێکە لە مۆدێلە بەناوبانگەکان لە بواری بەبیرهاتنەوە.

---

[٢] Hetherington, *Introduction to Psychology for medical students*, Pp.٦٣-٦٤.

شێوە ٨: مۆدێلی ئەتکنسن وشفرین بۆ بەبیرهاتنەوە




**مۆدێلی ئەتکنسن وشفرین**

لە شەستەکانی سەدەی رابردوو، ئەتکنسن وشـفرین مۆدێلێکیـان پێـشنیار کـرد بـۆ لێکدانـەوەی چـۆنیەتی روودانـی پرۆسـەی بەبیرهاتنـەوە. بـەپێی ئـەو مۆدێلـە، لـە

یەکەم هەنگاودا زانیاری دەگاتە (ذاکرة) هەستی ئینجا ئەگەر ئەو زانیاریە بایەخی پێ نەدرا، واتە گرنگ نەبوو لای کەسەکە، ئەوا لەماوەی کەمتر لە چرکەیەك لەبیردەکرێت. بەلاّم ئەگەر کەسەکە بایەخی بە زانیاریەکە دا ئەوا ئەو زانیاریە دەگوازرێتەوە بۆ (ذاکـرة) ی کورت خایەن. چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو زانیاریە چارەنووسی دیاری دەکات، ئینجا ئەگەر کەسەکە مامەڵەی لەگەڵ ئەو زانیاریە نەکرد ئەوا پاش ١٥ چرکە لە (ذاکـرة) کورت خایەن نامێنێت. ئەگەر کەسەکە مامەڵەیەکی لاوازی لەگەڵ زانیاریەکە کرد ئەوا زانیاریەکە بۆ ماوەیەکی درێژتر دەمێنێتەوە وپاشان لەبیردەکرێت. بەلاّم ئەگەر ئەو زانیاریە مامەڵەیەکی قووڵی لەگەڵ کرا ئەوا دەگوێزرێتەوە بۆ (ذاکـرة) درێژ خایەن. ئەو پرۆسەیە لە شێوەی خوارەوە روون کراوەتەوە.

١. ذاکرة ی هەستی Sensory Memory

ئەگەر هەر شتێك بەر هەستی مرۆڤ بکەوێت، ئەو شتە بۆ ماوەیەکی زۆر کورت لە ذاکرة ی هەستیدا دەمێنێتەوە وئەو مادەیەی کە لەو جۆرە ذاکـرة دەمێنێتەوە وەك وێنەی شتێکە لە مێشك پاش بینینی ئەو شتە. ئینجا ئەگەر مرۆڤ بایەخی بەو شتە یان زانیاریە نەدا ئەوا پاش کەمتر لە چرکەیەك ئەو شتە یان زانیاریە لەبیر دەچێت. بەلاّم ئەگەر مرۆڤ بایەخی پێدا ئەوا ئەو زانیاریە دەگوێزرێتەوە بۆ ذاکرة ی کورت خایەن.

٢. ذاکرة کورت خایەن Short-term Memory

ئەو جۆرە ذاکرة یە بە چەقی هۆشیاری دادەنرێت وبەپێی بۆچوونی ئەتکنسن وشفرین، ئەو ذاکـرة یە هەڵدەستێت بە هەڵگرتنی گشت ئەو زانیاری وبیرۆکە وشارەزاییانەی کە مرۆڤ ئاگای لێیانە لەکاتێکی دیاریکراودا، بەلاّم تەنها برێکی دیاریکراو لە زانیاریەکان تیایدا دەمێنێتەوە بۆ ماوەیەکی کورت (نزیکەی ١٥ چرکە) وهەندێك جار ئەو زانیاریە لەوانەشە بۆ ماوەی نیوکاتژمێریش بمێنێتەوە. ئەوەی راستی بێت مانەوەی ئەو زانیاریە بۆ ماوەی چەند خولەکێك لەرێگای دووبارەکردنەوەی زانیاریەکە دەبێت. بۆ نمونە کە ژمارەی تەلەفۆنی هاورێیەك وەردەگرین چەند جارێك دووبارەی دەکەینەوە هەتا نمرەکە لێدەدەین پاش تەواو

بـوونی تەلەفۆنەکـە، ئـەو ژمارەیـەمان لـەبیر دەچـێت ئەگـەر لـە جێگایەکـدا نـەی نووسین.

ئەو جۆرە ذاکرة یە، وێڕای هەڵگرتنی زانیاری، ڕۆڵی ڕاپەڕێنەریشی هەیە کە ئەویش بریتییە لە گواستنەوەی زانیاری بۆ ذاکرة ی درێژ خایەن.

٢. ذاکرة ی درێژ خایەن Long-term Memory

ئەگەر زانیاری لە ذاکرة ی کورت خایەن نەگوێزرایەوە بۆ ذاکرة ی درێژ خایەن ئـەوا لەبیردەکرێت، بەڵام بـۆ ئـەوەی زانیـاری بگوێزرێتـەوە بـۆ ذاکـــرة ی درێـژ خایـەن پێویـستە مامەڵەیـەکی قـووڵی لەگەڵـدا بکرێـت ئـەوەش لـە ڕێگـای بـەکارهێنانی شێوازەکانی لەبـەرکردن ومانـادان بـەو زانیاریـە وبەسـتنەوەی بـەو زانیاریانـەی کـە پێـشتر لـە ذاکـــرة ی درێـژ خایـەن هـەڵگیراون. جێگـای ئامـاژە پـێ کردنـە کـە پەیوەندیەکی بەردەوام لە نێـوان ذاکرة ی درێـژ خایـەن و ذاکرة ی کـورت خایەنـدا هەیە، واتە چۆن دەتوانرێت زانیاری لە ذاکرة ی کورت خایـەن بـۆ ذاکـــرة ی درێـژ خایەن بگوێزرێتەوە ئـەوەهاش دەتوانرێـت زانیـاری لـە ذاکـــرة ی درێـژ خایەنـەوە بگوێزرێتەوە بۆ ذاکرة ی کورت خایەن.

ذاکرة ی درێژ خایەن هەڵدەستێت بە هەڵگرتنی واتا وبیرۆکـەکان بـۆ چـەند ڕۆژێـك، چـەند مانگێـك، وچـەند سـاڵێك بـەڵکو زانیـاری بەدرێـژی تەمـەنی مرۆڤـ تیایـدا دەمێنێتەوە. هەروەها گـەڕان بـەدوای وەڵام لـە ذاکـــرة ی درێـژ خایەنـدا کـارێکی ئاسانە وبەخێرایی ئەنجام دەدرێت، ئەگەر ئەو زانیاریـەی بـەدوای دەگـەڕێین چـەند جارێك پێشتر بـەکارمان هێنـا بێـت، ئەگـەر نـا پرۆسـەی گـەڕان کـارێکی زەحمـەت وئەستەم دەبێت ولەوانەیە ئەو زانیاریەی بەدوای دەگەڕێین هەرگیز نەیدۆزینەوە.

شـتێرنبێرگ ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـە چـەند مـۆدێلێکی تـر پێـشنیارکران وەك ئەلتەرنـەتیف بـۆ مۆدێلەکـەی ئەتکنـسن وشـیفرین وەك مـۆدێلی چوارچـێوەی ئاستەکانی پرۆسێسکردن، کە لەلایەن کرایك ولۆکهارت پێشنیار کـرا، کـە بـڕوای بـە بوونی سێ جۆر ذاکرة نییە بەڵکو هەڵگرتن لەسەر ئاستی جیاوازدا ئەنجام دەدرێت، ومۆدێلی ذاکرة ئیشکەر کە لەلایەن ئالان بادێلی پێشنیار کرا وتیایدا ذاکرة ی کورت خایەن وبەشێك لە ذاکرة ی درێژخایەنی لەژێر یەك بـەش کـۆکردەوە کـە نـاوی لێنـا

ذاكرة ی ئیشکەر، ومۆدێلی ذاكرة ی فرەسیستەم کە ئێندل تولڤینگ پێشکەشی کرد کە تیایدا ذاكرة بۆ سێ جۆر دابەش دەکات: ذاكرة ی سیمانتیکی و ذاكــرة ی ڕووداو و ذاكرة ی کرداری[٣]. هەرچەندە فێرخوازی سایکۆکۆجی پێویستە بەقووڵی بچێتە ناو ئەو مۆدێلانە، لەو کتێبە تەنیا ئاماژەیەکی خێرامان بۆ کرد. کتێبەکەی شتێرنبێرگ بە تێروتەسەلی باسی ئەو مۆدێلانە دەکات بۆ ئەوەی حەز بکات زیاتر دەربارەیان بزانێت.

**ئەو فاکتەرانەی کار لە بەبیرهاتنەوە دەکەن**

بەبیرهاتنەوە، وەك پرۆسەیەکی عەقلی، کۆمەڵێك فاکتەر کاری تێدەکەن. گرنگترین ئەو فاکتەرانە ئەمانەی خوارەوەن:

١. تەمەن: لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە توانای بەبیرهاتنەوە بە شێوەیەکی خێرا گەشە دەکات لە نێوان تەمەنی دە تا بیستساڵیدا وئەو توانایە دەگاتە بەرزترین ئاستی لە تەمەنی بیست ساڵیدا. پاشان بەرەبەرە توانای بەبیرهاتنەوە لاواز دەبێت بەتایبەتی لە تەمەنی پیریدا واتە پاش ٦٠ ساڵیدا کە توانای ذاكرة ی کورت خایەن لە گواستنەوەی زانیاری نوێ بۆ ذاكــرة ی درێژ خایەن لاواز دەبێت هەرچەندە توانای ذاكرة ی درێژ خایەن تارادەیەك وەکو خۆی دەمێنێتەوە. بۆ نمونە لەوانەیە کەسێکی تەمەن ٦٠ یان ٧٠ ساڵی بیرەوەری چل پەنجا ساڵ پێش ئێستای بێتەوە یاد بەڵام لەوانەیە بەزەحمەت ناوی نەوەکانی بێنەوەیاد. هەر بۆیەشە توانای فێربوون لەو تەمەنە زۆر لاواز دەبێت کوردیش تێبینی ئەوەی کردووە وگوتویەتی بەو کەسەی کە بیەوێت بە پیری فێری شتێکی نوێ ببێت: بە پیری دێتە بەر هەویری! بەڵام مەسەلەی لاواز بوونی توانای بەبیرهاتنەوە بەندە بە سروشتی زانیاری وپیشەی مرۆڤ.

٢. سروشتی زانیاری: ئەو زانیاریانەی کە مانادارن ئاسانتر لەبەردەکرێن ودێنەوە یاد لەو زانیاریانەی کە بێ مانان، بۆ نمونە هاتنەوەیادی پەندێك ئاسانترە لە هاتنەوەیادی کۆمەڵە وشەیەکی بێ مانا، وهەروەها بەبیرهاتنەوەی زانیاری ڕێك وپێك ئاسانترە لە بەبیرهاتنەوەی زانیاری نارێك وپێك.

[٣] Sternberg, R. (٢٠٠٣). *Cognitive Psychology*, Pp. ١٥٨-١٦٥.

٣. شێوازی فێربوون: ئەو شێوازەی بەکاردەهێنرێت لە فێربوونی یان هەڵگرتنی زانیاریەکە کار دەکاتە سەر چۆنیەتی ئەو زانیاریە دێتەوە یادمان. ئەو شێوازەش بەندە بە سروشتی زانیاریەکە لەلایەك وئاستی خوێندن لەلایەکی ترەوە. بۆ نمونە هەندێك کەس ئەگەر زانیاری بە شێوازی گشتی (یان کلـي) فێرببن، ئەوا ئەو زانیاریەیان بە ئاسانتر دێتەوە یادیان وهەندێك کەسی تر بە پێچەوانە.

٤. جیاوازی تاکەکەسی: ئەو کەسانەی کە خاوەن ئاستێکی زیرەکی بەرز وپاڵنەرێکی بەهێزن بۆ فێربوون، چاکتر وئاسانتر فێری زانیاری دەبن لەو کەسانەی کە ئاستی زیرەکیان نزمە یان پاڵنەری فێربوونیان سستە. ئەو فێرخوازەی کە زوو فێر دەبێت، زووتر وزیاتر ئەو شتانەی کە فێری بووە دێتەوەیادی ئەگەر بەراوردی بکەین بەو کەسەی کە درەنگ فێر دەبێت.

٥. ڕەگەز (نێر ومێ): هەرچەند ئەنجامی لێکۆڵینەوەکان لەو بوارەدا لەیەك جیاوازن، بەڵام وادیارە کە کچان لە پرۆسەی هەڵگرتن وهێنانەوەیادی زانیاریە زمانەوانیەکان لە کوڕان چالاکترن. کوڕانیش چالاکترن لە هەڵگرتن وهێنانەوەیادی ئەو زانیاریانەی کە پەیوەندیان بە بیرکاری ومیکانیك هەیە.

## لەبیرچوون

ئەزریجاوی بەو شێوەی خوارەوە پێناسەی لەبیرچوون دەکات:

"نەتوانینێکی سروشتی بەبیرهاتنەوەی ئەو زانیاریانەی یان کارامە جوڵەییانەی کە فێرخواز پێشتر فێریان بووە، ئەو نەتوانینە لەوانەیە گشتی بێت یان تایبەتی، بەردەوام بێت یان کاتی"[4].

هەرچەندە زۆربەی خەڵك جەخت لەسەر لایەنە زیان بەخشەکەی دەکەن، ئەوەی ڕاستی بێت لەبیرچوون چەند لایەنێکی [illegible]

وەڵامی پرسیارێك لە کاتی [illegible]

لەبیرچوونەوە، غەم وپەژارەک[illegible]

لەبیر نەکەین ناتوانین فێری وەڵامی

---

[4] فاضل الأزريجاوي، أسس علم النفس التربوي، ص: ١١٤.

**بیردۆزەکانی لەبیرچوون**

یەکەم دەروونزان کە بە شێوەیەکی زانستی دیراسەتی لەبیرچوونەوەی کرد، هێرمان ئێبینکهاوس بوو لە ئەڵمانیا کە چەماوەی لەبیرچوونەوەی داهێنا. بەڵام ئەوەی زیاتر دەروونزانەکان بایەخی پێدەدەن ئەوەیە کە ئێمە لەبەرچی شتمان یان زانیاریمان لەبیردەچێتەوە. بۆ ئەو مەبەستە چەند بیردۆزێك پێشنیار کران ولێرەدا بە کورتی باسی دوو لەم بیردۆزانە دەکەین کە بریتین لە بیردۆزی تێکەڵاوبوون (Interference) وبیردۆزی داخوران (Decay).

١. بیردۆزی داخوران یان بیردۆزی بەکارنەهێنان (Disuse): کۆنترین بۆچوون هۆی لەبیرچوونەوە دەگەڕێنێتەوە بۆ پرۆسەی سست بوون بەهۆی کات بەسەرچوون، بەمانایەکی تر: تێپەڕبوونی کات هۆی لەبیرچوونەوەیە. بەپێی ئەو بۆچوونە ئەو کاریگەریانەی کە لە ئەنجامی فێربووندا لە توێکلی مێشکدا دروست بوون بە تێپەڕبوونی کات سست ولاواز دەبن. ئەوەی ڕاستی بێت ئەو بۆچوونە ڕەخنەی لێگیرا چونکە چەند کارامەیەك هەن کە بە تێپەڕبوونی کات لەبیرناچنەوە وەك لێخوڕینی ماشین یان مەلەکردن. تۆ ئەگەر فێری مەلەکردن بوویت وبۆ ماوەیەکی درێژیش مەلەت نەکردبێت ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی مەلەکردنت لەبیربچێتەوە هەروەها لێخوڕینی ماشین بەهەمان شێوە. ئەوەش مانای وایە کە فاکتەرێکی تر هەیە بێجگە لە کات کە دەبێتە هۆی لەبیرچوونەوە.

٢. بیردۆزی تێکەڵبوون: ئەو بۆچوونە جەخت لەسەر ئەو ڕووداوانە دەکات کە دەکەنە نێوان فێربوون ولەبیرچوون، واتە ئەو ڕووداوانەی کە پاش فێربوون دێنە کایەوە ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە دیاردەی لەبیرچوون. ئەوەی ڕاستی بێت تێکەڵبوونیش دەکرێتە دوو جۆر: تێکەڵبوونی پاشتر وتێکەڵاوبوونی پێشتر.

- تێکەڵبوونی پاشتر (Retroactive interference) ئەنجامی ڕوودانی چالاکیەکە پاش فێربوونی زانیاریەك وپێش ئەوەی داوامان لێبکرێت ئەو زانیاریە بهێنینەوە یادمان. بۆ نمونە ئەگەر پارچە هۆنراوەیەکی نالی لەبەر بکەیت ویەکسەر لەدوای ئەو پارچە هۆنراوەیەکی حاجی قادر لەبەر بکەیت، وپاشان داوات لێبکرێت کە پارچە هۆنراوەکەی نالی بڵێیتەوە، ئیحتیمالی زۆرە کە لەبیرت چووبێتەوە.

- هەرچی تێکەڵبوونی پێشترە (Proactive interference) کاتێك ڕوودەدات کە هەندێك زانیاری پێشکەش دەکرێن پێش پێشکەش کردنی ئەو زانیاریانەی کە دەمانەوێ فێریان ببین°. بۆ نمونە ئەگەر هەندێك ژمارەت پێ نیشان بدەن بەڵام داوات لێ نەکرێت ویەکسەر کۆمەڵە ژمارییەکت پێ نیشان بدرێت وداوات لێ بکرێت کە لەبەریان بکەیت، ئەوا ئیحتمالی زۆرە کە ئەو ژمارانەت نایەتەوەیاد بە باشی چونکە ژمارەکانی پێشتر لەگەڵیان تێکەڵ بوون.

بەپێی ئەو بیردۆزە لەوانە هەندێك مادەی تر تێکەڵ ببن لەگەڵ ئەو مادەیەی کە دەمانەوێت فێری ببین، جا ئەو تێکەڵ بوونە چ پێش پرۆسەی فێربوون بێت چ دوای ئەو پرۆسەیە بێت. ئینجا ذاکرة ی درێژ خایەن سەرقاڵی ئەو زانیاریانە دەبێت کە مەبەستمان نییە فێریان ببین ولەو نێوانەدا ئەو زانیاریانەی کە دەمانوێت فێریان ببین ناتوانرێ بگوێزرێنەوە بۆ ذاکرة ی درێژخایەن بۆیە پاش ماوەیەکی کورت لەبیرمان دەچێتەوە.

**ئەمنێسیا ونیمۆنیسیا**

ئەمنێشیا (یان ئەمنێسیا) (Amnesia) کە بەزمانی عەرەبی پێی دەگوترێت: فقدان الذاكرة، بریتییە لە پەککەوتنی ذاكــرة بەشێوەیەکی نائاسایی. ئەمەش چەند جۆرێکی هەیە:

جۆری یەکەم: ئەمنێشیای پاشەکی (Retrograde Amnesia) کە بریتییە لە پەککەوتنی ذاكرة لە هێنانەوە یادی هەندێك زانیاری پاش ڕوودانی تراومایەك یان ڕووداوێکی ترسناك.

جۆری دووەم: ئەمنێشیای شیرخۆری (Infantile Amnesia) کە بریتییە لە بەبیرنەهاتنەوەی ئەو ڕووداوانەی کە لە قۆناغی ژیانی شیرخۆریماندا (واتە پێش تەمەنی سێ ساڵی) تووشیان هاتووین.

° Sternberg, R. (٢٠٠٣). *Cognitive Psychology*, p. ١٩٤.

جۆری سێیەم: ئەمنێشیای پێشەکی (Anterograde Amnesia) کە بریتییە لە بەبیرنەهاتنەوەی ئەو شتانەی کە پاش ڕووداوێکی ترسناك ڕوویانداوە وتەنیا ئەو شتانەی بەبیردێتەوە کە پێش ئەو ڕووداوە فێریان بووە وهەڵیگرتوون لە ذاکرة[٦].

نیمۆنیشیا (یان نیمۆنیسیا) (Mnemonisia) کە پێچەوانەی ئەمنێشیایە، ئەو کەسەی تووشی ئەو حالەتە بوویێت ئەوا دەبێتە خاوەن ذاکرة یەکی لەڕادەبەدرە بەهێز کە دەتوانێت هەرشتێکی بووێت بەبیری بێتەوە. بەڵکو هەندێك جار خاوەن ئەو حالەتە نایەوێت هەندێك شتی بێتەوە یاد، بەڵام ئەو شتانە هەر دێنەوەیادی ئەوەش دەبێتە مایەی بێزاربوون ونارەحەتی. بەناوبانگترین حالەت هی ئەو پیاوە بوو کە دەروونزانی روسی ئەلکساندەر لوریا دیراسەی کرد لە شەستەکانی سەدەی رابردوو.

**خۆت تاقی بکەوە!**

١. بەبیرهاتنەوە چۆن پێناسە دەکرێت؟ دەتوانیت بە کورتی باسی دوو لە بیردۆزە فسیۆلۆجیەکان بکەیت کە تەفسیر بەبیرهاتنەوە دەکەن؟
٢. دەتوانیت باسی مۆدێلەکەی ئەتکنسن وشیفرین بکەیت لە بواری بەبیرهاتنەوە؟
٣. ئەو فاکتەرانە چین کە کار لە پرۆسەی بەبیرهاتنەوە دەکەن؟
٤. لەبیرچوون چییە؟ بەناوبانگترین دوو بیردۆز کە تەفسیری ئەو دیاردە دەروونییە دەکەن چین؟
٥. جیاوازی نێوان ئەمنێسیا ونیمۆنێسیا چییە؟

---

[٦] سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ١٦٩-١٧٠.

# پاڵدەر وهەڵچوون

**یەکەم: پاڵدەر**

تێبینی کردن ووەسف کردنی رەفتار بە تەنیا هیچ بەهایەکی زانستی ئەوتۆی نییە بەبێ گەڕان بەدوای هۆیەکان. بەڵام پرۆسەی گەڕان بەدوای هۆ لەبواری دەروونزانیدا کارێکی ئاسان نییە چونکە لەوانەیە هەمان هۆ ئەنجامی جیاواز بەرهەم بێنێت وەیان زیاتر لە هۆیەك بەشداری بکەن لە بەرهەم هێنانی رەفتارێك یان زنجیرە رەفتارێك. ئێمە لە ژیانی رۆژانەماندا، چ هەستی پێ بکەین یان نا، بەدوای هۆی رەفتاری خەڵك دەگەڕێین وزۆرجار دەپرسین: ئەو منداڵە بۆچی لەدوای دایکی دەگرییێت؟ ئەو گەنجە بۆچی جل وبەرگی سەیری لەبەرکردووە؟ وچەندەها پرسیاری تریش لەو شێوەیە کە لەوانەیە بتوانین وەڵامی هەندێکیان بدەینەوە، بەڵام وەڵامی هەندێکی تریان نازانین ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە رەفتاری مرۆڤ هەندێکجار سادە وساکارە ودۆزینەوەی هۆیەکەی ماندووبونێکی زۆری ناوێ. هەندێك جۆر لە رەفتاری مرۆڤ ئەوەندە ئاڵۆزن وهۆیەکانیان نادیارە وبەئاسانی ناتوانیت بیدۆزیتەوە. ئینجا لێرەدا دەروونزانی هەوڵ دەدات رەفتار لێك بداتەوە وەك ئەنجامی هۆیەکی دیاریکراو کە پێی دەگوترێت پاڵنەر یان پاڵدەر.

زاراوەی پاڵدەر تەرجومەی وشەی (دافـع) ی عەرەبییە کە ئەویش تەرجومەی وشەی Motive ی ئینگلیزیە. ئەوەی راستی بێت وشەی Motive مانای بزوێنەر دەدات کە هەندێك جار وشەی (محـرك) ی عەرەبی بەرامبەر بەکاردێت. لێرەدا زاراوەی پاڵدەر بەکاردێت بۆ ئاماژە کردن بۆ بارێکی ناوەکی کە پاڵ بە مرۆڤ دەنێت بۆ ئەوەی رەفتارێکی تایبەتی بکات بە مەبەستی نەهێشتنی ئەو بارە ناوەکییە. کەواتە پاڵدەر گۆڕاوێکی گریمانییە چونکە ناتوانین بە شێوەیەکی راستەوخۆ تێبینی بکەین بەڵکو دەتوانین تێبینی ئەنجامەکانی بکەین وهەر لەبەر ئەوەشە دان بە بوونی دادەنێین ولەبەر ئەوەی ئەو ئەنجامانەش لەلایەن چەندیەوە دەگۆڕێن، وادادەنێین کە پاڵنەرەکەش گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

ئەوەی ڕاستی بێت هەندێك زاراوەی تر هەن کە لە مانای پاڵدەر نزیکن ولەوانەیە پێویست بێت کەمێك ڕۆشناییان بخرێتە سەر. گرنگترین ئەو زاراوانەش بریتین لە: ڕەمەك، پێویستی، ودنەدەر. لە خوارەوە بە کورتی باسیان دەکەین.

ڕەمەك: وشەی ڕەمەك تەرجەمەی وشەی (الغريزة) یە لە زمانی عەرەبی کە مانای سروشتیش دەگەیەنێت وتەرجەمەی وشەی Instinct بە زمانی ئینگلیزی. ئەو زاراوەیە کۆنترین زاراوەیە کە لە بواری دەروونزانی بەکارهاتبێت بۆ تەفسیر کردنی ڕەفتار. ڕەمەك بریتییە لە ئامادەبوونێکی زگماکی کە پاڵ بە زیندەوەر، چ ئاژەڵ چ مرۆڤ، دەنێت بۆ ئەوەی ڕەفتارێکی تایبەتی بکات لە بارودۆخێکی دیاریکراودا، بۆ نمونە جووجەڵە پاش چەند کاتژمێرێك لە دەرچوونی لە هێلکەکەیدا دەتوانێت دانەوێڵە بە دەنووکی هەڵبگرێت ئەوەش لەبەر بوونی ڕەمەکی، گەڕان بە دوای خواردنە، یان گریانی منداڵی تازە لەدایك بوو کە گوێی لە دەنگێکی بەرز دەبێت (ڕەمەکی ترس). وە بۆ ئەوەی بزانن مرۆڤ چەند ڕەمەکی هەیە، دەروونزانەکان چەند وەڵامێکی جیاجیان پێشکەش کرد. بەڕای ولیەم جێیمس، مرۆڤ ٣٢ ڕەمەکی هەیە، تۆرەندایك ٤٢ ڕەمەکی دیاریکرد، وبەناوبانگترین دەروونزان لەو بوارە کە ولیەم مکدۆگال بوو ئاماژەی بۆ ١٤ ڕەمەك کرد وبۆ هەر ڕەمەکێك هەڵچوونێکی دیاریکرد بۆ نمونە ڕەمەکی ڕاکردن هەڵچوونەکەی ترسە وڕەمەکی گەڕان بەدوای خواردن هەڵچوونەکەی برسیەتییە[١]... دەروونزانی تر هەن کە ژمارەی ڕەمەکەکانیان بۆ یەك یان دوو ڕەمەك کەم کردەوە، بۆ نمونە فرۆید لە سەرەتادا ئاماژەی بۆ دوو ڕەمەك کرد کە بریتی بوون لە ڕەمەکی ژیان وڕەمەکی مردن. ئادلەر، کە پێشتر شاگردی فرۆید بوو، بڕوای وابوو کە تەنها یەك ڕەمەك سەرچاوەی چالاکیەکانی مرۆڤە کە ئەویش ڕەمەکی کامڵ بوونە.

بۆ ماوەیەکی زۆر زاراوەی ڕەمەك بووە چەمکێکی سەرەکی لە دەروونزانی وژمارەشی گەیشتە شەش حەوت هەزار ڕەمەك!! هەندێك لە دەروونزانەکان بە هەستێکی ناوەکیان لە قەڵەم دا! ئەوەی ڕاستی بێت لەم دواییەدا واز لەم زاراوە

---

[١] د. حكمت درو الحلو ود. زريميق خليفة العكروتي، **مدخل إلى علم النفس**، (القاهرة: المكتب المصري، ٢٠٠٤)، ص٧٥.

هێنرا بە پاساوی ئەوەی کە هیچ بەهایەکی ڕوونکەرەوەی نییە. بۆ نمونە کە دەپرسین: بۆچی چۆلەکە دەفرێت؟ لە وەڵامدا بڵێین: چونکە ڕەمەکی فڕینی هەیە، ئەو وەڵامە هیچ بەهایەکی ڕوونەکەرەوە نادات بە دەستەوە.

**پێویستی:** ئەو زاراوە بەرامبەر وشەی Need ی ئینگلیزی و (حاجـــة) عەرەبی بەکارهاتووە. هەندێك جار ئەو زاراوە بە مانای پاڵدەر بەکاردەهێنرێت وبە شێوەیەکی گشتی پێویستیەکان بۆ دوو جۆر دابەش کراون: پێویستیە جەستەییەکان کە بریتین لە هەوا وئاو وخواردن وهتد.. وپێویستیە دەروونییەکان وەك هەست کردن بە ئاسایش وڕێز لێگرتن وخۆشەویستی وهتد.. دەروونزانی ئەمەریکی، ئەبراهام ماسلۆ، بیردۆزێکی لە بواری کەسایەتی پێشکەش کرد کە لەسەر بناغەی پێویستیەکان دامەزرابوو. لەبەر گرنگی ئەو بیردۆزە، لە خوارەوە بەکورتی ئاماژەی بۆ دەکەین.

بەپێی بۆچوونی ماسلۆ، پێویستیەکانی مرۆڤ لە پێنج ئاستدان وهەتا پێویستیەکانی ئاستی خوارەوە تێرنەکرێت، مرۆڤ بیر لە تێرکردنی پێویستیەکانی ئاستی سەرەوەتر ناکەتەوە.

١. ئاستی یەکەم بریتییە لە پێویستیەکانی جەستەی مرۆڤ وەك پێویستی بە خواردن وئاو وهەوا وگەرمی شتی تر.

٢. ئاستی دووەم بریتییە لە پێویستی بە هەست کردن بە ئارامی وئاسایش وخۆدوورخستنەوە لە مەترسیە دەرەکییەکان.

٣. ئاستی سێیەم بریتییە لە پێویستی بە خۆشەویستی وئینتیما واتە بەدەست هێنانی خۆشەویستی وسۆز وبایەخ پێدان لەلایەن کەسانی ترەوە.

٤. ئاستی چوارەم بریتییە لە پێویستی بە ڕێزلەخۆگرتن، واتە هەم مرۆڤ ڕێز لەخۆی بگرێت وهەم خەڵکیش ڕێزی لێ بگرن.

٥. ئاستی پێنجەم کە دوا ئاستە بریتییە لە پێویستی هێنانەدی خود ئەوەش بەندە بە هێنانەدی ئامانجە دوورەکان وگوزارشت کردن لە خود وخستنەکاری گشت توانا وبەهرەکانی مرۆڤ.

پێویستی بە
ڕێزلەخۆگرتن

پێویستی بە خۆشەویستی وئینتیما

پێویستی بە ئارامی وئاسایش

پێویستیە فسیۆلۆجیەکان

شێوە ٩: هەرەمی پێویستیەکان لەلای ئەبراهام ماسلۆ

دنەدەر: ئەو زاراوەیە تەرجەمەی وشەی (حـــافز) ە لـە زمانی عـەرەبی و وشـەی Incentive لەزمانی ئینگلیزی. ئەو زاراوەیە ئاماژە بۆ شتە مادی یان نامادیەکان دەکات کە پێویستیەك لە پێویستیەکانی مرۆڤ تێردەکەن، بۆ نمونە خواردن یان پارە یان خەڵات هتد.. ئەوەی ڕاستی بێت هەندێك لە نووسەران بە مانای پاڵدەر بەکاریان هێناوە وهەندێکی تر بە مانای وروژێنەر.

هەرچەندە دەتوانرێت پاڵدەرەکان بە چەند شێوەیەك پۆلێن بکرێن، بەڵام بۆ ئەوەی ئەو بابەتە لای خوێنەر ئاسان بکەین، لێرەدا بۆ دوو چەشن پۆلینیان دەکەین: پاڵنەرە فسیۆلۆجیەکان وپاڵنەرە سایکۆلۆجیەکان.

١. پاڵدەر فسیۆلۆجیەکان: ئەو جۆرە پاڵدەرانە زگماکن واتە مرۆڤ فێریان نابێت بەڵکو بەندن بە سروشتی جەستە ولەشی مرۆڤ. ئەوەی ڕاستی بێت مرۆڤ وئاژەڵ لەو جۆرە پاڵدەرانە هاوبەشن چونکە بەبێ تێر کردنیان ژیانی زیندەوەر دەکەوێتە مەترسیەوە. پێویستی بە هەوا وئاو وخواردن وگەرمی ونووستن چەند نمونەیەکن لەو جۆرە پاڵدەرە فسیۆلۆجیانە. هەرچەندە ئەگەر پاڵدەری جنسی تێرنەکرێت ژیانی مرۆڤ، وەك تاکە کەسێك، ناکەوێتە مەترسیەوە بەڵام ئەگەر هیچ مرۆڤێك تێری نەکات ئەوا ژیانی کۆمەڵگا دەکەوێتە مەترسی نەمان ولەناوچوون، بۆیە جنسیش بە پاڵدەرێکی فسیۆلۆجی حسێب دەکرێت. لەخوارەوە بە کورتی باسی تەنیا چوار جۆر لە پاڵدەر فسیۆلۆجیەکان دەکەین کە بریتین لە برسیەتی، تینویەتی، نووستن وجنس.

برسیەتی: بێگومان بۆ ئەوەی مرۆڤ بە کارەکانی ڕۆژانە هەڵبستێت، پێویستی بە وزە هەیە وخواردنیش سەرچاوەی سەرەکی وزەیە بۆ لەش وهەرکاتێك مرۆڤ یان ئاژەڵ هەستی کرد کە سەرچاوەی وزەی کەم بۆتەوە ئەوا هەوڵ دەدات لە ڕێگای خواردن ئەو سەرچاوەیە بەهێزکاتەوە. ئەوەش بەپێی یاسایەکی بایۆلۆجی کە پێی دەڵێن پاراستنی هاوسەنگی واتە لەشی مرۆڤ هەوڵ دەدات هاوسەنگی خۆی بپارێزی وهەرکاتێك ئەو هاوسەنگیە لەنگ بوو ئەوا لەشی مرۆڤ تووشی بارێکی گرژی دەبێت کە هانی دەدات بەدوای ئەو شتە بگەڕێت کە هاوسەنگی بۆ لەش بگەڕێنێتەوە. ئینجا کە هاوسەنگی گەڕاوە ئەوا حالەتی گرژی نامێنێت ومرۆڤ خاموش دەبێتەوە. بەڵام بابزانین ئێمە چۆن هەست بە برسیەتی دەکەین؟ لەوانەیە خوێنەر زوو وەڵام بداتەوە وبڵێت: هەرکە گەدەی مرۆڤ بەتاڵ بوو ئەوا هەست بە برسیەتی دەکات. بابزانین ئەو وەڵامە تا چ ڕادەیەك ڕاستە.

لەئەنجامی تاقیکردنەوەکان بەدیارکەوتووە کە کاتێك گەدە خواردنی تیادا نامێنێت، ماسولکە لووسەکانی گرژ دەبنەوە وهەرچەند ماوەی نان نەخواردن درێژتر بێت ئەو ماسولکانە زیاتر گرژ دەبنەوە. ئەو گرژ بوونەوەش لە ڕێگای دەمارەکان وەك چەند هێمایەك دەگاتە مێشك ولەئەنجامدا هەست بە برسیەتی دەکەین. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت گرژ بوونەوەی ماسولکەکانی گەدە تەنها

سەرچاوە نییە بۆ هەست کردن بە برسیەتی بەڵکو بە سەرچاوەیەکی لاوەکیش حسێب دەکرێت چونکە لە هەندێك تاقیکردنەوەدا لەسەر چەند مشکێك گەدەکانیان لێکرانەوە ولەهەندێك تاقیکردنەوەی تردا ئەو دەمارانەی کە گەدە بە مێشك دەبەستنەوە پچڕان، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مشکانە وەك مشکی ئاسایی هەڵسوکەوتیان دەکرد بەرامبەر بە خواردن کە ئەوەش مانای وایە کە گرژ بوونەوەی گەدە سەرچاوەی سەرەکی نییە بۆ هەست کردن بە برسیەتی. تاقیکردنەوەکان سەلماندویانە کە نزم بوونەوەی ئاستی شەکر (گلوکۆز) لە خوێندا هۆکاری سەرەکی هەست کردنە بە برسیەتی[٢]. ئەو ئەندامەی کە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لە کرداری هەست کردن بە برسیەتی وتێربوون لە ناو مێشکدا بریتییە لە هایپۆتالامۆس.

**تینویەتی: هەموومان دەزانین کە ئاو پێکهاتەیەکی سەرەکی لەشی زیندەوەرە ومرۆڤ ناتوانێت زیاتر لە چەند ڕۆژێك بێ ئاو بژیێت، بەڵام ئێمە چۆن هەست بە** تینویەتی دەکەین؟

لەوانەیە خوێنەر بڵێت لە ئەنجامی ووشك بوونی قورگ هەست بە تینویەتی دەکەین. هەرچەندە ئەو وەڵامە تارادەیەك ڕاستە بەڵام لە ئەنجامی چەند تاقیکردنەوەیەك تێبینی کرا کە ووشك بوونی قورگ تەنها هۆ نییە بۆ هەست کردن بە تینویەتی، بۆ نمونە لە یەك لەو تاقیکردنەوانە، لە ڕێگای لولەیەکی لاستیکی ئاو درا بە سەگێك بێ ئەوەی قورگی سەگەکە تەڕ ببێت، لەگەڵ ئەوەشدا سەگەکە تینویەتیەکەی شکا. ئەو تاقیکردنەوانە ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کە هەست کردن بە تینویەتی لەئەنجامی کەم بوونەوەی ئاوە لەناو خانەکانی لەش بەگشتی وگرنگترین هۆکار کەم بوونەوەی ئاوە لە چەند خانەیەکی دیاریکراو لە هایپۆتالامۆس کە لە ئەنجامدا فرمان بە ئاو خواردنەوە دەدات. کەواتە هایپۆتالامۆس لێرەشدا دەورێکی گرنگ دەبینێت لە هەست کردن بە تینویەتی وگەڕان بەدوای ئاو ودیاریکردنی ئاستی تێربوون.

[٢] Lahey, B. (٢٠٠٤). *Psychology: An introduction*. P.٣٧١.

نووستن: نووستنیش یەکێکە لە پاڵنەرە جەستەییە زیندەگرنگەکان چونکە ئەگەر ئاژەڵ یان مرۆڤ بۆ ماوەیەکی زۆر نەنوێت ئەوا مەترسی مردنی لێدەکرێت. ئەوەی راستی بێت پاش ئەوەی رێگا نەدرا بە چەند ئاژەڵێك کە بنوێت ئەو ئاژەڵانە لە ئاکامدا مردن. هەروەها ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوەکانی کە لەسەر مرۆڤ ئەنجامدرا تێبینی ئەوە کرا کە ئەگەر مرۆڤ بۆ ماوەی سێ رۆژ نەخەوێت ئەوا هەست بە ماندووبوون دەکات وشتی لە پێش چاو لێڵ دەبێت وچالاکی نزم دەبێتەوە وشتی لەیاد دەچێت. مێشك بە گشتی، وبە تایبەتی مێشکی ناوەراست وتالامۆس هایپۆتالامۆس وتوێکلی مێشك، دەورێکی گرنگ دەبینن لە رێکخستنی خەوهاتن وماوەکەی. سەبارەت بە ماوەی خەوتن لە مرۆڤێك بۆ مرۆڤێکی تر دەگۆرێت وباری دەروونی ومەسەلەی داب ونەریت وفێربوون کاری تێدەکەن.

جنس: ئەو پاڵنەرە بەلای کەمەوە لەدوو لایەندا جیاوازە لەو پاڵنەرانەی کە پێشتر باسمان کردن. لایەنی یەکەم ئەوەیە کە ئەو پاڵنەرە وەنەبێ لەگەڵ لەدایك بوونی مرۆڤدا سەر هەڵ بدات وەك برسیەتی وتێنویەتی، بەڵکو تا قۆناغی هەرزەکاری مرۆڤ هەستی پێ ناکات. هەرچەندە فرۆید بروای وانییە بەڵام بۆچوونی ئەو دەربارەی ئەو مەسەلەیە بەڵگەی بەهێزی نییە. لایەنی دووەم ئەوەیە کە تێرنەکردنی ئەو پاڵنەرە نابێتە مایەی هیچ مەترسیەك بۆ سەر ژیانی تاك، پێچەوانەی برسیەتی وتێنویەتی، بەڵام ئەگەر هیچ کەسێك ئەو پاڵنەرە تێر نەکات ئەوا کۆمەڵگای مرۆڤایەتی تووشی قڕان دەبێت. بۆیە گشت کۆمەڵگە مرۆییەکان گرنگیان بەو پاڵنەرە داوە وشێواز تێرکردنیان رێکخستووە لەرێگای هاوسەریەتی (ژن هێنان ومێرد کردن) کە ببێتە مایەی سوود بۆ تاك وکۆمەڵگا.

بناغەی فسیۆلۆجی ئەو پاڵنەرە لە ئەندامی زاوزێ کردنە لای پیاو وئافرەت. لای پیاو هۆرمۆنی ئەندرۆجین کە دەرژێتە ناو خوێن، بەهاوکاری چەند هۆرمۆنێکی تریش هەن کە سایرۆیدە گلاند دەیان رژێنێ، دەور دەبینن لە پەیدا بوون وبەهێزبوونی ئەو پاڵنەرە. دوو هۆرمۆن هەن لای ئافرەت، کە بریتین لە ئیسترۆجین وبرۆجستین، کە گلاندی زاوزێ کردنە دەیان رژێنێتە ناو خوێن وپەیوەندیەکی بەهێزی بە سوری مانگانە لای ئافرەت هەیە. دیارە سەبارەت بە پاڵنەری

جنسیش، هایپۆتالامۆس دەورێکی باڵا دەبینێت، بەڵام جنس زیاتر پاڵنەرە کە مرۆڤ خۆی دەوری سەرەکی دەبینێت لە وروژاندنی وچۆنیەتی تێرکردنی وە لایەنی فسیۆلۆجی، بەتایبەتی ئەو هۆرمۆنانەی کە پەیوەندیان بە جنسەوە هەیە، دەورێکی لاوەکی دەبینن ئەگەر بەراورد بکرێن بە دەوری هۆرمۆنەکان لەسەر لایەنی جنسی لای ئاژەڵ[٢].

### ١. پاڵدەرە دەروونیە- کۆمەڵایەتیەکان

ئەو جۆرە پاڵنەرانە هەڵقوڵاوی دەروونی مرۆڤن وچونکە مرۆڤ لە بۆشاییدا ژیان بەسەر نابات، بەڵکو لە ناو کۆمەڵگایەک، بۆیە ئەو جۆرە پاڵنەرانە مۆرکی کۆمەڵایەتی وەردەگرن. کەواتە شتێکی ئاساییشە کە ئەو پاڵنەرانە لە کۆمەڵگای جیاواز شێوەی جیاواز جیاواز وەربگرن. لێرەدا ئاماژە بۆ هەندێك لەو پاڵنەرانە دەکەین:

**پاڵنەری کۆبوونەوە:** لەڕاستیدا لە کۆنەوە بڕوا وابوو کە ئەو پاڵنەرە پاڵنەرێکی زگماکە وپەیوەندی بە کۆمەڵ نییە؛ بەڵام پاش ئەنجام دانی چەند تاقیکردنەوەیەك دەروونزانەکان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە ئەو پاڵنەرە زگماك نییە وبەڵگەیان نەبوونی ئەو پاڵنەرەیە لەلای مرۆڤ لە دوو ساڵ ونیوی تەمەنی. پاش ئەو تەمەنە هەست بەو پاڵنەرە دەکرێت. ئەوەی ڕاستی بێت گرنگی ئەو پاڵنەرە لەوەدایە کە منداڵ پاش لەدایك بوونیدا بێ هێز ودەسەڵاتە وئەگەر کەسانی دەوروبەری، وبەتایبەتی دایك، پێویستیە سەرەکیەکانی تێر نەکەن ئەوا ئەو منداڵە ناتوانێت بژیێت. هەر بۆیەشە ئەو پاڵنەرە لە گشت کۆمەڵگاکانی مرۆڤ هەیە.

**پاڵنەری لاساکردنەوە:** مەبەست ئەوەیە کە هەموو مرۆڤێك، لە قۆناغێك یان چەند قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانیدا، حەز دەکات لاسای کەسانی تر بکاتەوە. ئەو پاڵنەرە بە شێوەیەکی ئاشکرا لە قۆناغی منداڵیدا تێبینی دەکرێت لەوانەیە هۆیەکەشی ئەوە بێت کە لاسا کردنەوە ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی فێربوون لەو قۆناغەدا. هەندێك لە دەروونزانەکان بڕوایان وایە کە منداڵ لە ڕێگای لاساکردنەوەی

[٢] Lahey, *Psychology: An introduction*, P. ٤٣٧.

دایك وباوك وئەو كەسانەی لە دەوروبەری دان فێری زمان وگەلێك لە كارامەیی كۆمەڵایەتی دەبێت.

**پاڵنەری دوژمنایەتی:** مەبەست لە دوژمنایەتی ئازار گەیاندنە بە كەسانی تر بە شێوەیەكی مادی وەك لێدان وكوشتن ویان بە شێوەیەكی نامادی وەك جوێن دان وبریندار كردنی هەستی بەرامبەر. ولیەم مكدۆگال بڕوای وابوو كە ئەو پاڵنەرە ڕەمەكێكی سروشتییە لای مرۆڤ. بیردۆزێكی تر هۆی ئەو پاڵنەرە دەگەڕێنێتەوە بۆ سەرنەكەوتن لە تێركردنی هەندێك لە پێویستیە گرنگەكانی مرۆڤ. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت لێكۆڵینەوەكانی مارگرێت مید، لەسەر كۆمەڵگا سەرەتاییەكان، ئاماژەیان بۆ ئەوە كرد كە ئەو پاڵنەرە لە هەموو كۆمەڵگایەك بەدی ناكرێت بۆ نمونە لە نێوان هۆزەكانی ئەرابیش لە غینیای نوێ هیچ شێوەیەك لە شێوەكانی دوژمنایەتی بەدی ناكرێت بەڵكو ژیانێكی ئاسوودە دەبەنەسەر، بێ شەڕ وشۆڕ. ئەوەش بە پێچەوانەی هۆزی مۆندۆگۆمەری دراوسێیان كە هەستی دوژمنایەتی وناحەزیان تیادا باوە. بەپێی بۆچوونی مید، جیاوازی نێوان ئەو هۆزانە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی شێوازی پەروەردە كردنی منداڵ تیایاندا.

**پاڵنەری موڵكداریەتی:** مەبەست لە موڵكداریەتی خاوەنداریەتی شت ومەكی مادیە ومكدۆگال ئەو پاڵنەرەی بە ڕەمەك لە قەڵەم دا، واتە لای هەموو كەسێك هەیە، بەڵام دووبارە لێكۆڵینەوەكانی مارگرێت مید گومانی خستە سەر ئەو بۆچوونە چونكە مید تێبینی كرد كە ئەو پاڵنەرە لای هەندێك لە هۆزەكانی ئەفریقیا تێبینی ناكرێت وەك هۆزی ئەراپیش كە پێشتر ئاماژەمان بۆ كردن. دكتۆر موستەفا محمود لە لێكۆڵینەوەیەكی لەسەر هۆزەكانی شیلوك لە خوارووی سودان تێبینی كرد كە موڵكداریەتی لای ئەو هۆزە زۆر لاوازە ئەگەر بەراورد بكرێن بە كۆمەڵگا تازەكان.

ئەوەی ڕاستی بێت پاڵنەری دەروونی - كۆمەڵایەتی زۆرن ولاهێی ئا[illegible]
[illegible]ی گرنگ دەكات كە بریتین لە[٤]:

[illegible]

[illegible] نوێ و گۆڕان دەگەڕێت.

---

[٤] Lahey, *Psychology: An introduction*, Pp. ٣٧٥-٣٧٨.

٢. پاڵنەری بەدەستهێنان: مەبەستی پاڵنەری سەرکەوتن بە دەست هێنانە جا لە هەر بوارێك بێت، خوێندن، کارکردن، وهتد..

٣. پاڵنەری ئینتما: کە نزیکە لە پاڵنەری کۆبوونەوە کە پێشتر باسمان کرد.

**دووەم: هەڵچوون**

هەڵچوون تەرجومەی وشەی (انفعال) ی عەرەبییە کە ئەویش تەرجومەی وشەی Emotion ی ئینگلیزیە. دکتۆر عبد الستار تاهیر شەریف وشەی تاوگیری لەجیاتی هەڵچوون پێشنیار دەکات بەڵام وادیارە نە وشە کوردیەکان ونە وشە عەرەبیەکەش پڕ بە پێستی وشە ئینگلزیەکەیە بەڵام دیارە حاڵی حازر لەو وشانە چاکترمان لەبەردەست دا نین.

هەڵچوون چییە؟ ئەوەی ڕاستی بێت هەندێك لە نووسەران پێیان ڕاست نییە کە بابەتی هەڵچوون بە پێناسە هەڵچوون دەست پێ بکات[٥]. بەڵام پێشکەش کردنی چەند پێناسەیەك بۆ ئەو زاراوەیە ڕۆشنای دەخاتە سەر خاڵە گرنگەکانی بابەتەکە یارمەتی خوێنەر دەدات کە بە شێوەیەکی باشتر بابەتەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە. بۆیە لێرەدا دوو پێناسە دەخەینە ڕوو. یەکەم پێناسە هەڵچوون بە گۆڕانێکی دەروونی جەستەیی لەناکاو دادەنێت کە مرۆڤ تووشی سەرلێشێوان دەکات ودەتوانرێت ئاسەواری ئەو گۆڕانە لەسەر ڕەفتاری دەرکی باباى هەڵچوو تێبینی بکرێت[٦]. لاهێی پێناسەی هەڵچوون دەکات بەو شێوەیە: **بریتیە لە چەند هەستێکی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ، کە بە شێوەیەکی گشتی بریتیە لە کاردانەوە بۆ ورپاکەرەوە، کە ووروژانی فسیۆلۆجی ورەفتاری تایبەتی لەگەڵدایە**[٧].

ئەوەی ڕاستی بێت هەڵچوون پەیوەندیەکی بەهێزی ڕاستەوخۆی بە پاڵنەرەکان هەیە وهەندێك جار هەڵچوون خۆی لەخۆیدا دەبێتە پاڵنەرێك بۆ ئەنجامدانی ڕەفتارێکی دیاریکراو. وهەروەها هەڵچوون وەك فاکتەرێك کار لە زۆربەی

---

[٥] **بڕوانە:** عبد الستار ابراهيم ورضوى ابراهيم، **علم النفس: أسسه ومعالم دراساته** (القاهرة: الدار العربية للنشر والتوزيع، ط٣، ٢٠٠٣) ص ٤٢٥.

[٦] **بڕوانە:** د. حكمت درو الحلو، د. زريڤ خليفة العكروتي، **مدخل إلى علم النفس**، ص٨٧.

[٧] Lahey, *Psychology: An introduction*, P. ٣٦٩.

پاڵنەرەکان دەکات بۆ نمونە ئەگەر تۆ غەمبار بیت، کە جۆرێکە لە هەڵچوون بە مانای سایکۆلۆجیەکەی، لەوانەیە ئەگەر برسیشت بێت بەڵام ئارەزووی خواردن ناکەیت! بۆیە لێرەدا بەدوای بابەتی پاڵدەرەکانی باسی دەکەین. باسەکەشمان دەکەین بە دوو بەش: بەشی یەکەم باسی جۆرەکانی هەڵچوون دەکەین ولە بەشی دووەم باسی سێ لە بیردۆزە گرنگەکانی هەڵچوون دەکەین.

## جۆرەکانی هەڵچوون:

مرۆڤ چەند جۆرە هەڵچوونی هەیە؟ لێرەدا هەوڵ دەدەین وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە وبەشێوەیەکی سەرەکی پشت بە کتێبە بەنرخەکەی لاهێی دەبەستین لە ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتە.




شێوە ۹: نەخشەی هەڵچوونەکانی واتسن وتێلێجین

دێڤید واتسۆن وئۆوك تێلێجێن بڕوایان وایە كە هەموو هەڵچوونەكانی مرۆڤ لە تێكەڵ بوونی دوو جۆری سەرەكی هەڵچوون پێك دێن كە بریتین لە هەڵچوونی نێگەتیڤ (ناخۆش) وهەڵچوونی پۆزەتیڤ (خۆش). بۆ ئەو مەبەستە نەخشەیەكیان پێشنیار كرد كە تیایدا جێگای هەڵچوونە گرنگەكانیان دیاریكرد (بڕوانە شێوە ٩)[٨].

ئەو نەخشەیە لە دوو ڕەهەند پێك دێت: پۆزەتیڤ/نێگەتیڤ وبەرز/نزم، بەشی لای چەپ هەڵچوونی پۆزەتیڤە وبەشی لای ڕاست نێگەتیڤ وبەشی سەرەوە ئاستی هەڵچوونی بەرزە وبەشی خوارەوە ئاستی هەڵچوونی نزمە. بەپێی ئەو نەخشەیە هیچ هەڵچوونێك لە نێوان هەڵچوونی پۆزەتیڤی نزم ونێگەتیڤی نزمدا نییە. ترسان، بە پێی ئەو نەخشەیە بریتیە لە هەڵچوونێكی نێگەتیڤی بەرز بە پێچەوانەی دڵخۆشی. بەڵام هەست كردن بە بەختیاری بریتییە لە هەڵچونێكی پۆزەتیڤی مامناوەندی وغەمباریش لەلایەكی ترەوە بریتیە لە هەڵچوونێكی نێگەتیڤی كەمێك بەرز. هەروەها دەبینین هەڵچوونی سەرسوڕمان بریتییە لە تێكەڵەی هەڵچوونێكی نێگەتیڤ وپۆزەتیڤی كەمێك بەرز.
ئەوەی ڕاستی بێت ئەو نەخشەی سەرەوە هەندێك هەڵچوونی تێدا نییە بۆ نمونە خۆشەویستی ئەوەش چونكە خۆشەویستی بریتیە لە سۆز یان عاتیفە كە لە چەند هەڵچوونێكی جیاوازی سەر نەخشەكە پێك دێت.

**بیردۆزەكانی هەڵچوون:**
كۆمەڵە بیردۆزێك پێشنیار كران بۆ لێكدانەوەی چۆنیەتی ڕوودانی هەڵچوون. لێرەدا ئاماژە بۆ سێ لەو بیردۆزانە دەكەین كە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. **بیردۆزی جێیمس ـ لانج:** ئەو بیردۆزە لەلایەن ولیەم جێیمس، دەروونزانی ئەمەریكی، وكارل لانج زانای فسیۆلۆجی دانیماركی دانراوە. بە پێی ئەو بیردۆزە ورياكەرەوەی هەڵچوو بە ڕێگای تالامۆس دەچێت بۆ پەلئەندامەكان كە كاردانەوەی ترس بەرهەم دەهێنن. پاشان ئەو هەستەی كە لە پەلئەندامەكان دروست بووە

[٨] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٨٧.

دەگوازرێتەوە بۆ توێکڵی مێشك وئینجا هەست کردن بە ترس پەیدا دەبێت. جێیمس دەڵێ: ئێمە هەست بە غەم دەکەین چونکە دەگرین، هەست بە تووڕەیی دەکەین پاش لێدان وهەست بە ترس دەکەین پاش لەرزین.

دیارە ئەو بیردۆزە گەلێك رەخنەی لێگیرا بەڵام کارۆل ئیزارد هەڵسا بە وەڵامدانەوەی ئەو رەخنانە و هەندێك گۆرانی بەسەر ئەو بیردۆزەدا هێنا. بە پێی بۆچوونی ئیزارد، کاردانەوەی روو ئیشارەت بۆ مێشك دەنێرێت بۆ ئەوەی هەڵچوونی دیاریکراو بەرهەم بهێنێت، نەك پەلئەندامەکان وەك پێشتر جێیمس و لانج بۆی چووبوون. ئەوەی راستی بێت ژمارەیەکی زۆر لە تاقیکردنەوەکان پاڵپشتی ئەو بۆچوونەی ئیزارد دەکەن.

٢. **بیردۆزی کانون ـ بارد:** والتەر کانون رەخنەی لە بیردۆزی جێیمس ـ لانج گرت وبیردۆزێکی تری پێشنیار کرد بۆ روونکردنەوەی چۆنیەتی هەڵچوون. پاشان فیلیپ بارد کەمێك گۆرانی بەسەر ئەو بیردۆزەدا هێنا وبیردۆزەکە بەو شێوەیە دیاردەی هەڵچوون لێکدەداتەوە: زانیاری لە وریاکەرەوە هەڵچووەکە یەکەمجار دەچێت بۆ تالامۆس پاشان زانیاریەکە لە هەمان کاتدا دەچێت بۆ توێکڵی مێشك، کە هەڵچوون بەرهەم دەهێنێت، ودەچێت بۆ هایپۆتالامۆس وکۆئەندامی دەماری سەربەخۆ بۆ بەرهەم هێنانی ووروژاندی فسیۆلۆجی پێویست کە یارمەتی زیندەوەر دەدات کە بە شێوەیەك لە شێوەکان کاریداتەوە. بە پێی ئەو بۆچوونە هەستکردن بە هەڵچوون وکاردانەوەی لەش لەهەمان کاتدا روودەدەن.

٣. **بیردۆزی مەعریفی:** ئەو بیردۆزە هاوچەرخە زادەی بیربۆچوون وتاقیکردنەوەی کۆمەڵێك لە دەروونزانەکانە وەك مەگدا ئارنۆلد وئەلبێرت ئەلیس وکەسانی تر. ئەو بیردۆزە جەخت دەکات لەسەر تەفسیر کردنی هەڵچوون کە بە دوو هەنگاو تێدەپەڕێت: هەنگاوی یەکەم بریتیە لە تەفسیر کردنی وریاکەرەوە وەك لە ژینگە ودەوروبەردا هەیە وهەنگاوی دووەم بریتیە لە تەفسیرکردنی ئەو وریاکەرەوەی کە لە لەش سەرچاوەدەگرێت لە ئەنجامی ووروژاندنی کۆئەندامی دەماری سەربەخۆ[٩].

---

[٩] بڕوانەی سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە: ٢٨٨-٢٩٣.

ئەوەی ڕاستی بێت لە ناوەندی نۆەتەکانی سەدەی ڕابردوو زارەوەیەکی نوێ داهێنرا کە پەیوەندیدیەکی توندی بە هەڵچووندا هەیە ئەویش زاراوەی زیرەکی هەڵچوونیە کە تەرجومەی زاراوەی Emotional Intelligence کە گۆلمان بەکاری هێنا ویەکەم کتێبی دەربارەی نووسی لە ساڵی ١٩٩٥. مەبەست لەو چەمکە بوونی کۆمەڵە خاسیەت وسیفەتێکی کەسایەتییە کە پەیوەندی هەیە بە مەهاراتی کۆمەڵایەتی وسۆزی کە یارمەتی خاوەنەکەی دەدات لە حالەتی دەروونی خۆی وهەست ونەستی خەڵکی تر بگات[١٠].

**خۆت تاقی بکەوە!**

١. دەتوانیت پێناسەی ئەو زاراوانە بکەیت: پاڵدەر، ڕەمەك، دنەدەر؟
٢. چیت لەبیر ماوە دەربارەی هەرەمی ماسلۆ بۆ پێویستیەکان؟
٣. دەتوانیت باسی ڕۆڵی هایپۆتالامۆس بکەیت لە پاڵدەرە فسیۆلۆجیەکان؟
٤. باسی دوو لە پاڵنەرە دەروونی ـ کۆمەڵایەتیەکان بکە.
٥. چۆن پێناسەی هەڵچوون دەکەیت؟
٦. چیت دەربارەی نەخشەکەی واتسۆن وتێلێجین لەیاد ماوە؟
٧. گرنگترین ئەو سێ بیردۆزە چین کە دیاردەی هەڵچوون لێکدەدەنەوە؟ بە بۆچوونی خۆت کامەیان لە ڕاستی نزیکترە؟

---

[١٠] عبد الستار ابراهيم ورضوى ابراهيم، علم النفس: أسسه ومعالم دراساته، ص٤٤١.

# فێربوون

بابەتی فێربوون گرنگترین بابەتە لە دەروونزانی وبە دەگمەن کتێبێکی دەروونزانی گشتی بەشێك بۆ ئەو بابەتە تەرخان نەکات. هۆی ئەوەش ئەوەیە کە فێربوون چەمکێکی فرەوانە وتەنیا مەسەلەی فێربوونی نووسین وخوێندنەوە ناگرێتەوە بەڵکو بوارێکی بەرفرەوان دەگرێتە خۆی لە ژیانی ئادەمیزاددا ودەتوانرێت ئەو بوارانە بکرێن بە چوار بەش:

١. فێربوونی نەریت وکارامەییەکان (العادات والمهارات)

٢. فێربوونی زانیاری وواتاکان (المعلومات والمعاني)

٣. فێربوونی رەفتاری کۆمەڵایەتی

٤. فێربوونی جیاکەرەوەکانی تایبەتی تاکەکەس (المميزات الفردية الخاصة)

لەبەر ئەوەی خاڵی چوارەم بە بەشێك لە خاڵی یەکەم دادەنرێت، ئەوا لێرەدا تەنها باسی سێ خاڵ دەکەین.

**یەکەم: فێربوونی نەریت وکارامەییەکان**

نەریت، یاخود العادة بە زمانی عەرەبی، بریتییە لە هەر چالاکیەك کە مرۆڤ پێی هەڵدەستێت بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی وبەئاسانی لە ئەنجامی دووبارەکردنەوەی. کارامەیی، واتە المهارة بە زمانی عەرەبی، بریتییە لە چەند نەریتێکی جوڵەیی کە ئامانجێکی کۆمەڵایەتی هەیە. ئەوەی ڕاستی بێت پەیوەندیەکی بەهێز لە نێوان نەریت وکارامەیی هەیە بۆ نمونە نووسین بە دەستی ڕاست هەم نەریتە وهەم کارامەشە بەڵام پێکەنین یان قسە کردن بە دەنگێکی بەرز نەریتە وکارامەیی نییە. کەواتە ئەو بوارە چەندەها لایەنی چالاکی مرۆڤ دەگرێتەوە وەك فێربوونی ڕۆیشتن وڕاکردن وبازدان وچالاکییە جەستەییەکانی تر هەروەها چەند چالاکیەکی تریش دەگرێتەوە وەك قسە کردن و نووسین ومۆسیقا لێدان وئەو چالاکیانەی تر کە ماسولکەی ووردی لەشی تیادا بەکاردێت.

**دووەم: فێربوونی زانیاری وواتاکان**

مرۆڤ بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ دەوروبەری سروشتی وکۆمەڵایەتی بگونجێت پێویستە زانیاری هەبێت دەربارەی ئەو دەوروبەرە بۆ نمونە پێویستە ناوی خەڵك

وئاژەڵ وشت وشوێن بزانیت ومانای ووشەکانیش فێربێت چونکە هەروەك دەزانین زمان بریتییە لە گرنگترین رێگا بۆ خۆگونجاندن ورێك کەوتن لەگەڵ خەڵکدا. کەواتە ئەو بوارە هەموو ئەو زانیارانە دەگرێتەوە کە مرۆڤ دەربارەی دەوروبەرەکەی وەریدەگرێت ویارمەتی دەدات بۆ ئەوەی خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێت بە شێوەیەکی چاك وبەسوود.

**سێیەم: فێربوونی رەفتاری کۆمەڵایەتی**

دیارە مرۆڤ ناتوانێت بە تەنیا ژیان بەسەر ببات بەڵکو لە ناو کۆمەڵە کەسێك دەژێیت وکاریان تێدەکات وکاری تێدەکەن ولە ئەنجامی ئەو کارلێککردنە مرۆڤ فێری چەندەها رێگا دەبێت بۆ چۆنیەتی دەربڕینی هەست وسۆز ومەیل وهەڵویست وهەڵسان بە رۆڵی کۆمەڵایەتی خۆی.

ئەوەی راستی بێت هەرچەندە ئێمە بە جیا باسی ئەو سێ جۆرە فێربوونەمان کرد، بەڵام پەیوەندیەکی بەهێز بەیەکتریان دەبەستێتەوە بۆ نمونە قسە کردن هەم کارامەییە وهەم فێربوونی واتای وشەیە وهەم بریتییە لە رەفتارێکی کۆمەڵایەتی لە هەمان کاتدا. لێرەدا گرنگی وفرەوانی بابەتی فێربوونمان بۆ دەردەکەوێت تا رادەیەك کە هەندێك لە دەروونزانان بڕوایان وایە کە هەموو رەفتاری مرۆڤ، کە بابەتی دەروونزانییە، ئەنجامی فێربوونە هەتاکو ئەو شتانەی لێیان دەترسین لە ئەنجامی فێربوونە وهەروەها ئەو حەز کردن یان رق لێبوونەوە لە شتێك یان کەسێك هەمووی لە ئەنجامی فێربوونە. کەواتە فێربوون چییە؟

دەروونزانەکان کۆمەڵێك پێناسەیان بۆ فێربوون پێشنیار کردووە وجیاوازیش لە نێوان ئەو پێناسانەدا هەیە. هۆی ئەو جیاوازیانەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە فێربوون گۆڕاوێکی گریمانییە (متغیر فرضـــي) واتە بەرجەستە نییە بەڵام هەموو دەروونزانەکان دان بە بوونی دێنن لەکاتی لێکدانەوەی ئەو گۆڕانانەی لە رەفتاری مرۆڤ تێبینی دەکرێن. کەواتە فێربوون کردارێکی ناوەکییە وە یان گۆڕانێکی تارادەیەك جێگیرە، لە رەفتار یان شارەزاییدا، لە ئەنجامی چالاکی تاکە کەس خۆی، نەك لە ئەنجامی گەشەی سروشتی یان باری کاتی. بینجامین لاهێی

پێناسەیەکی نزیك لەوە باس دەکات کە دەڵێت:[1] فێربوون هەر گۆڕانێکی تارادەیەك جێگیرە لە ڕەفتار ڕوودەدات لە ئەنجامی شارەزاییدا واتە کارلێککردن لەگەڵ ژینگەدا. لاهێی زیاتر ڕۆشنایی دەخاتە سەر پێناسەکەی وئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەموو گۆڕانێك لە ڕەفتاردا لە ئەنجامی فێربوون نییە بەڵکو ئەو گۆڕانە دەبێت تا ڕادەیەك جێگیر بێت، واتە کاتیی نەبێت. وە هەروەها ئەو گۆڕانە پێویستە لە ئەنجامی خیبرە بێت نەك بە هۆی فاکتەری بایۆلۆجی وەك دەرمان، یان ماندووبوون، یان پێگەیشتن ویان بریندار بوون. هەروەها مەرج نییە ئەو گۆڕانەی کە لە ڕەفتار ڕوودەدات یەکسەر بتوانین تێبینی بکەین ومەرجیش نییە فێربوون بە ئەنقەست بێت ولاهێی نمونەیەك دەهێنێتەوە ودەڵێت: ئەگەر تۆ ساندویشێکی ماسی بخۆیت ولە دوایدا بڕشێیتەوە، ئەوا بەبێ ئەنقەست تۆ فێر دەبیت هەر کە ساندەویشێکی ماسیت بینی هەست دەکەیت لەوانەیە بڕشێیتەوە.

**هۆکارەکانی فێربوون**

بۆ ئەوەی فێربوون ڕووبدات پێویستە کۆمەڵێك هۆکار یان مەرج یان بنەما هەبن، واتە ئەو پرۆسەیە لە خۆیەوە ڕوونادات. بەڵام نووسەران کۆك نین لەسەر ژمارەی ئەو هۆکار ومەرج وبنەمایانە، هەندێکیان ئاماژە بۆ سێ هۆکار دەکەن وەك مەرجی فێربوون[2] وهەندێکی تر باسی هەشت بنەما دەکەن بۆ فێربوون[3]. لێرەدا ئێمە باسی ئەو هۆکارانە دەکەین کە هەموو دەروونزانەکان لەسەری ڕێککەوتوون:

١. **پێگەیشتن (النضج)**: پەیوەندیەکی بەهێز هەیە لە نێوان پێگەیشتن وفێربوون بەڵکو هەندێك لە دەروونزانەکان بە یەك چاو تەماشایان دەکەن وبە یەك شت لە قەڵەمیان دەدەن. دەتوانرێت پێناسەی پێگەیشتن بکرێت وەك گۆڕان لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی تر کە ببێتە هۆی گۆڕانی ڕەفتار. گرنگی پێگەیشتن بۆ هاتنەدی فێربوون زۆر ئاشکرایە بۆ نمونە منداڵ لە تەمەنی دوو مانگیدا ناتوانێت

[1] Lahey. B. (٢٠٠٤). *Psychology: An introduction.* ٥th ed. Boston: McGraw-Hill, p: ١٩٨.

[2] أصول علم النفس، د. أحمد عزت راجح.

[3] المرجع في علم النفس، د. سعد جلال، وعلم النفس، د. محمد أبو العلا أحمد ود. محمد خليفة بركات.

فێری ڕۆیشتن ببێت چونکە هێشتا ئەو ئەندامانەی لەشی کە بە کرداری ڕۆیشتن هەڵدەستێت پێنەگەیشتووە ونەگەیشتۆتە ئاستی پێویست بۆ هەڵسان بەو کردارە. بە کورتی فێربوون بەبێ پێگەیشتن ڕوونادات ئەو مەسەلەیەش لە ژیانی ڕۆژانەماندا زۆر ئاشکرایە وپێویست بە نمونەی تر ناکات.

٢. پاڵنەر (الدافع): بێ گومان خوێنەر لە ژیانی ڕۆژانەیدا تێبینی ئەوەی کردووە، چ لەسەر خۆی چ لەسەر خەڵکی دیکە، کە ئەگەر کەسێك ئارەزووی لە کارێك بێت ئەوا بە ئاسانی وبە خێرایی فێری دەبێت وبە پێچەوانەش ئەگەر کەسێك ئارەزووی کارێکی نەبێت بە زەحمەت ودرەنگ فێری دەبێت، ئەوە ئەگەر هەر فێری ببێت. ئەوەی ڕاستی بێت ئارەزوو پاڵنەر لای مرۆڤ دروست دەکات ولە ئەنجامدا پرۆسەی فێربوون ئاسان دەبێت وهەرچەندە پاڵنەرەکە بەهێزتر بێت فێربوون خێراتر ئەنجامدەدرێت. دەروونزانەکان بەبەردەوامی پاڵنەر بەکار دەهێنن لەکاتی ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکانیان لەسەر چۆنیەتی فێربوونی ئاژەڵ وبەهێزترین پاڵنەر لای ئاژەڵ، برسیەتییە. ئینجا ئەو دەروونزانانە تێبینیان کرد کە ئەگەر ئاژەڵ برسی نەبێت، واتە پاڵنەرێك نەبێت، ئەوا ئەو ئاژەڵانە هیچ چالاکیەکی وەها ئەنجام نادەن کە لە ئەنجامدا فێری شتێك ببن. بوونی حەز وهەڵوێستیش دەکەوێتە ژێر خانەی پاڵنەرەکان چونکە دەبنە هۆی ئاسان کردنی پرۆسەی فێربوون. سەبارەت بە ڕۆڵی پاڵنەر لە فێربووندا، گیتس بڕوای وایە کە پاڵنەر سێ فرمانی هەیە لە کرداری فێربووندا:

- بەهێزکردنی ڕەفتار
- هەڵبژاردنی وەڵامدانەوەیەك کە پێویستیەك تێر بکات، وەك گەڕان بە دوای خواردن.
- ئاڕاستەکردنی ڕەفتار بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو.

٣. **بەهێزکردن**[٤] (التعزيز): مەبەست لە بەهێزکردن هەر کردارێکە کە ببێتە هۆی دووبارەبوونەوەی ڕەفتارێك یان وەڵامدانەوەیەك. زۆر لە تاقیکردنەوەکان لە بواری فێربووندا کاریگەری بەهێزکردنیان سەلماند وبیردۆزەکانی هۆڵ وثۆرندایك وسکینەر جەغت لەسەر گرنگی بەهێزکردن دەکەن لە کاتی فێربوون وبەڕای وان فێربوون بەبێ بەهێزکردن ئەستەمە. بۆ نمونە ئەگەر منداڵێك یارمەتی منداڵێکی تری دا وئێمە پاداشتمان کرد، واتە ئەو ڕەفتارەمان بەهێزکرد، ئەوا ئەو منداڵە فێری ڕەفتاری یارمەتی دان دەبێت. بەڵام ئەگەر لەسەر کارەکەی پاداشتمان نەدا، ئەوا ئەگەری زیاتر ئەوەیە کە منداڵەکە لە پاشەڕۆژدا ئەو کردارە دووبارە ناکاتەوە.

٤. **ئامادەبوون** (الاستعداد): ئامادەبوون بریتییە لە تێکەڵاوێك لە هۆکارەکانی گەشەکردنی ناوەکی وئەنجامی مەشق کردن وشارەزایی. دیارە شتێکی ئاشکرایە کە ئامادەبوون بۆ پیشەیەك فێربوونی ئەو پیشەیە ئاسان دەکات چونکە ئەو ئامادەبوونە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو کەسە ئاگاداری خۆی بخاتە سەر ئەو بابەتەی کە دەیەوێت فێری ببێت وهەموو شتێکیش لە بیری خۆی دووردەخاتەوە ئەو کارەش یارمەتی ئەو کەسە دەدات کە گشت وزەی عەقلی خۆی بخاتە کار بۆ فێربوونی ئەو پیشەیە کە خۆی بۆ ئامادە کردووە.

دیارە چەند هۆکارێکی دیکەش هەن کە کار دەکەنە سەر پرۆسەی فێربوون وەك زانینی ئەنجامی کار، یاخود بە زمانی ئینگلیزی پێی دەگوترێت فیدباك Feedback، وئامانج ومەبەست لەو کارەی کە کەسەکە پێی هەڵدەستێت وشارەزایی پێشتر ومەسەلەی مەشق کردن لەسەر کارەکە وچەندەها هۆکاری تریش کە دەبنە هۆی ئەوەی پرۆسەی فێربوون یان ئاسانتر وخێراتر بێت ویان زەحمەتتر ودرەنگتربێت.

**بیردۆزەکانی فێربوون**

---

[٤] لە قاموسی دەروونناسی، دکتۆر عبد الستار وشەی پتەوکردنی بەکارهێناوە بەڵام وابزانم وشەی بەهێزکردن لە زاراوە ئینگلیزیەکە نزیکترە کە بریتییە لە Reinforcement کە لە ڕەگەوە لە وشەی force هاتووە کە زیاتر بە مانای هێز دێت نەك پتەوی.

لەبەر فرەوانی وجۆراوجۆری بابەتی فێربوون، ژمارەیەك لە بیردۆز پێشنیار کران بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە: چۆن فێربوون ڕوودەدات؟ بەشێوەیەکی گشتی دەتوانرێت بیردۆزەکانی فێربوون بۆ سێ کۆمەڵە دابەش بکرێن:

١. بیردۆزەکانی بەیەکەوەبوونی ورپاکەرەوە ووەڵامدانەوە کە لە گاتری دەروونزان پێشنیاری کردن ولە تاقیگەکانی بەڵگەی بۆ کۆکردنەوە.

٢. بیردۆزەکانی بەهێزکردنی ورپاکەرەوە ووەڵامدانە وکە یەکەم جار لەلایەن تۆرەندایك پێشنیار کران وپاشان هۆڵ وسپێنس ومیلەر ودولارد گەشەیان پێیاندا.

٣. بیردۆزەکانی زانیاری وتێبینین کە تۆلمان گەشەی پێدان ولیڤین وهارتمان لە بواری فێرکردن جێ بەجێیان کردن.

هەروەها دەتوانرێت بیردۆزەکانی فێربوون بە شێوازێکی تر پۆلین بکرێن کە لە پۆلین کردنەکەی سەرەوە بچێت بەڵام لەوانەیە ئاسانتر وروونتر بێت.

کۆمەڵەی یەکەم: پێیان دەگوترێت بیردۆزەکانی پەیوەستی کە بیردۆزەکانی پاڤلۆڤ وواتسۆن وگاتری وئێیتس دەگرێتەوە. ئەو بیردۆزانە سوورن لەسەر گرنگی دان بە پەیوەستی نێوان ڕەفتار وڕووداوەکانی دەوروبەر وکرداری فێربوون بە پێی بۆچوونی ئەوان بریتییە لە کرداری پەیوەستی، بەڵام خاوەن ئەو بیردۆزانە لەسەر سروشتی ئەو پەیوەستییە جیاوازن وهەریەکە بە شێوەیەکی جودا وەسفی دەکات.

کۆمەڵەی دووەم: پێیان دەگوترێت بیردۆزە وەزیفیەکان کە تۆرندایك وهۆڵ وسکینەر ڕابەریەتی دەکەن. ئەو کۆمەڵە بیردۆزە بایەخ بە وەزیفەکانی ڕەفتار دەدەن وپەیوەستی لێرەدا دەورێکی گرنگی نییە.

کۆمەڵەی سێیەم: بریتین لەو بیردۆزانەی کە زیاتر جەخت لەسەر گرنگی کردارە ناوەکیەکان دەکەن، وەك بیرکردنەوە ونەخشەدانان وبڕیاردان وکرداری تر، نەك دەوروبەر ودەتوانین بیردۆزی گیشتاڵت لای ڤێرتهێمەر وکۆفکا وکۆهلەر وبیردۆزەکانی پیاجێ وتۆلمان وباندۆرا لەژێر ئەو خانەیە دابنێین.

چونکە ئەو کتێبە پێشەکیەکە لە دەروونزانی وتایبەت نییە بە بیردۆزەکانی فێربوون، لێرەدا لەهەر کۆمەڵە بیردۆزێك بە کورتی تەنیا باسی دوو بیردۆز دەکەین. بۆ زیاتر قووڵ بوونەوە لەو بابەتە، خوێنەر دەتوانێت ئەو سەرچاوانە بخوێنێتەوە کە لە کۆتایی ئەو کتێبە باس کراون.

## کۆمەڵەی یەکەم: بیردۆزەکانی پەیوەستی

### ١. بیردۆزی فێربوونی مەرجدار (التعلم الشرطي)

ڕەگ وریشەی ئەو بیردۆزە دەگەڕێتەوە بۆ زانای فسیۆلۆجی ڕوسی ئیڤان پاڤلۆڤ (١٨٤٩-١٩٣٦) کە لە ڕاستییدا پسپۆری دەروونزانی نەبوو بەڵام ئەو ئەزموونانەی کە ئەنجامیدا بوونە بناغەی بیردۆزی فێربوونی مەرجدار. ئەزموونەکانی پاڤلۆڤ لەسەر پرۆسەی هەرس کردن بوو لای سەگ ولە ئەنجامیشدا خەڵاتی نۆبلی لەو بوارەدا بەدەست هێنا. پاڤلۆڤ تێبینی کرد کە کاتێك سەگ پارچە گۆشتێك لەبەردەم خۆی دەبینێت لیکی دەڕژێت، ئەو کردارەش، واتە لیك ڕژان، بریتییە لە وەڵامدانەوەیەکی نامەرجی واتە سروشتییە وئاژەڵەکە فێری نەبووە. گۆشتەکەی بەردەمی سەگەکە بریتییە لە وریاکەرەوەیەکی نامەرجی، واتە ئەو وریاکەرەوەیە بە سروشتی خۆی دەبێتە هۆی ڕژانی لیك لەلای سەگ. ئەو ئەزموونەی کە پاڤلۆڤ پێی هەڵسا بریتی بوو لە لێدانی زەنگ پێش ئەوەی گۆشتەکە پێشکەش بە سەگەکە بکرێت. دیارە زەنگ خۆی لە خۆیدا وریاکەرەوەیەکی بێ لایەنە وهیچ پەیوەندی بە لیك ڕژان نییە. بەڵام پاش ئەوەی چەند جارێك زەنگ لێدرا پێش ئەوەی گۆشتەکە بدرێت بە سەگەکە، پاڤلۆڤ تێبینی کرد کە هەرکاتێك سەگەکە گوێی لە زەنگەکە دەبێت، پێش ئەوەی گۆشتەکەش ببینێت، لیکی دەڕژێت. لەو حالەتەدا زەنگەکە دەبێتە وریاکەرەوەیەکی مەرجدار وڕژانی لیك لە ئەنجامی بیستنی زەنگ دەبێتە وەڵامدانەوەیەکی مەرجدار. دەتوانرێت ئەو ئەزموونە بە سێ هەنگاو کورت بکرێتەوە:

١. گۆشت (وریاکەرەوەی نامەرجدار) ← لیك ڕژان (وەڵامدانەوەی نامەرجدار)

٢. گۆشت + زەنگ ← لیك ڕژان

٣. زەنگ (ورپاکەرەوەی مەرجدار) ← لیك ڕژان (وەڵامدانەوەی مەرجدار)

کەواتە سەگەکە فێر بوو کە بە بیستنی زەنگ لیك بڕژێت، ئـەو وەڵامدانەوەیـە بـە وەڵامدانەوەیـەکی مەرجـداری کلاسـیکی دەژمێردرێـت کـە بریتییـە لـە سـاکارترین وسادەترین جۆری فێربوون. ئەوەی ڕاستی بێت پاڤلۆڤ یەکەم کەس نەبوو کـە ئـەو دیاردەیەی دۆزیەوە بەڵکو پێش ئەو بختریف ئاماژەی پێ کردبوو.

دەروونزانی ئەمەریکی جۆن واتسن (١٨٧٨–١٩٥٨) لە بیستەکانی سەدەی بیستەم هەوڵیدا کە بیردۆزی پاڤلۆڤ لەسەر مرۆڤ جێ بـەجێ بکـات ئـەوەش نمونەیەکـە لـە ئەزموونەکانی واتسن لەو بـوارەدا. واتـسن ئەزموونەکـەی لەسـەر منـداڵێك کـرد کـە ناوی ئەلبێرت بوو. واتسن بۆ یەکەم جار جورجێکی سپی بە ئەلبێرت نیشان دا بـۆ ئەوەی بزانێت ئایا لێی دەترسێت یان نا. ئەلبێرت لـە جورجەکـە نەترسـا ودەسـتی کرد بە یاریکردن لەگەڵیدا. لەو کاتەدا واتسن وای کرد کە دەنگێکی بـەرز لـە پـشت ئەلبێرتەوە بێت. ئەو دەنگە بـەرزە بـووە هـۆی ئـەوەی کـە ئـەلبێرت بگرییـت، بـە حوکمی ئەوەی منـداڵ بـە شـێوەیەکی سروشـتی لـە دەنگـی بـەرز دەترسـن. پـاش دووبارە کردنەوەی ئەو ئەزموونـە چـەند جارێـك، واتـە یـاری کـردن لەگـەڵ بینـینی جورج وبیستنی دەنگە بەرزەکە، ئەلبێرت فێربوو کە لە جورج بترسێت ئەگـەر هـیچ دەنگێکی بەرزیش نەبیستێت[٥].

پاڤلۆڤ لە ئەنجامی ئەزموونەکانی ئەو پرینسیپانەی خوارەوەی دۆزیەوە:

١. بەهێزکردن: واتە وەڵامدانـەوەی مەرجـدار بـەهێز دەبێـت ئەگـەر لـە دوای ورپاکەرەوەی مەرجدار ورپاکەرەوەی نامەرجدار بێت، واتە پاش زەنگەکە خواردن بێت بۆ سەگەکە.

٢. کوژانـــەوە: ئەگـــەر بـــۆ چـــەند جارێـــك پـــاش ورپاکـــەرەوەی مەرجـــدار ورپاکـــەرەوەی نامەرجـــدار نـــەهات، ئـــەوا وەڵامدانـــەوەی مەرجـــدار دەکوژێتەوە ونامێنێت.

[٥] Santrock, J. W. (٢٠٠٥). *Children*. ٨th ed. Boston: McGraw-Hill, p:٤٩.

٣. بەگشت کردن: واتە هەر ورياکەرەوەيەك ئەگەر لە ورياکەرەوەی مەرجدار بچێت ئەوا وەڵامدانەوەی مەرجدار دروست دەکات.

٤. جوداکردنەوە: واتە دەتوانين بگەينە وەڵامدانەوەی مەرجدار بە بەهێز کردنی ورياکەرەوەيەکی دياريکراو وبەهێز نەکردنی ئەو ورياکەرەوانەی کە پێی دەچن، بۆ نمونە دەتوانين وا لە سەگ بکەين کە تەنها بۆ زەنگی بەرز وەڵام بداتەوە نەك بۆ زەنگی نزم.

١. بيردۆزی بەيەکەوەبوون

ئەدوين گاتری (١٨٨٦–١٩٥٩) ئەو بيردۆزەی پێشنيار کردووە کە لە سەر بناغەی پەيوەستی کاتی (واتە زەمەنی) نێوان ورياکەرەوە ووەڵامدانەوە، واتە بەيەکەوەبوونی ورياکەرەوە ووەڵامدانەوە، دامەزراوە. کەواتە هەرکاتێك بەيەکەوەبوون ئەوا فێربوون ڕوودەدات وبە پێچەوانەش هيچ فێربوونێك ڕوونادات.. گاتری بايەخ بە بەهێزکردن نادات وهيچ گرنگيەك بۆ مەشق کردن دانانێت. ئەوەی ڕاستی بێت جياوازی نێوان فێربوونی مەرجدار وفێربوونی بەيەکەوە لەوەدايە کە لە جۆری يەکەم پەيوەستی نێوان دوو ورياکەرەوە دروست دەبێت کە بريتين لە ورياکەرەوەی نامەرجدار وورياکەرەوەی مەرجدار، بەڵام لە جۆری دووەم پەيوەستی لە نێوان ورياکەرەوە ووەڵامدانەوە دروست دەبێت.

دەتوانرێت بيردۆزی گاتری لەو خاڵانەی خوارەوە کورت بکرێتەوە:

١. فێربوون پەيوەستييەکی کاتييە لە نێوان ورياکەرەوە ووەڵامدانەوە.
٢. مرۆڤ يان فێردەبێت ويان فێر نابێت.
٣. کوژانەوەی وەڵامدانەوە کردارێکی پەيوەستی نوێيە.
٤. پاداشت، يان بەهێز کردن، پێويست نييە لە کرداری فێربووندا.
٥. پاڵنەر بريتييە لە ورياکەرەوەيەکی ناوەکی بەردەوام.

گاتری وهاوڕاکانی ئەزموون وتاقيکردنەوەيەکی زۆريان لەسەر مرۆڤ وئاژەڵ ئەنجامدا بە مەبەستی پاڵپشتی کردن لە بيردۆزەکەيان. بۆ ئەوەی نمونەيەك بهێنينەوە بۆ جێ بەجێ کردنی بيردۆزەکە با بگەڕێينەوە بۆ ئەزموونەکەی واتسن لەسەر ئەلبێرت. بە پێی بۆچوونی گاتری فێربوونی ترسان لە جورجەکە بە هۆی

ئەوە بوو کە ورياکەرەوەکە، واتە جورجەکە، وەڵامدانەوەيەکی ڕاکێشا کە ترسان بوو، چونکە جورجەکە بەديار کەوت لە کاتی ترسانی منداڵەکە، کەواتە پەيوەستی لە نێوانيان دروست بوو وبەو شێوەيە منداڵەکە فێری ترسان بوو لە جورج نەک لەبەر ئەوەی کە بينينی جورجەکە لەگەڵ دەنگە بەرزەکە هاوکات بوون.

## کۆمەڵەی دووەم: بيردۆزە وەزيفيەکان

### ١. بيردۆزی فێربوون بە هەوڵ دان وهەڵەکردن

تۆرەندايك (١٨٧٤–١٩٤٩) دامێنەری ئەو بيردۆزەيە لە بواری فێربووندا. کرۆکی ئەو بيردۆزە ئەوەيە کە مرۆڤ يان ئاژەڵ بە هۆی هەوڵ دان وهەڵە کردن فێر دەبێت، بۆ نمونە پشيلەيەکی برسی لەناو کارتۆنێك دابنێين کە دەرگاکەی دەبێتەوە ئەگەر پشيلەکە پاڵ بنێت بە پارچە دارێك لە ناوەوەی کارتۆنەکە ولەدەرەوەی کارتۆنەکەش خواردن بۆ پشيلەکە دانراوە. پاش چەند هەوڵدانێك، پشيلەکە بە ڕێکەوت پاڵ دەنێت بە پارچە دارەکە ودەرگای کارتۆنەکە دەبێتەوە وپشيلەکە دێتە دەرەوە وخواردنەکەی دەخوات. ئەگەر بۆ جاری دووەم هەمان پشيلە لەناو هەمان کارتۆن دابنێين، دەبينين پاش چەند هەوڵێکی کەمتر لە ژمارەی هەوڵەکانی يەکەم جاردا، پاڵ بە پارچە دارەکە دەنێت ودێتە دەرەوە. ئەگەر ئەم تاقيکردنەوەيە بۆ چەند جارێکی تريش دووبارە بکەينەوە، دەبينين کە پشيلەکە هەرکە خستمانە ناو کارتۆنەکە بە هەوڵ وکاتێکی کەم دێتە دەرەوە. تۆرەندايك ئەو تاقيکردنەوەيە والێکدەداتەوە کە پشيلەکە کەم کەمە واز لە هەوڵە بێ سوود وسەرنەکەوتووەکانی دەهێنێت وتەنها هەوڵە سەرکەوتووەکان دووبارەدەکاتەوە، کە بە سوودن لە کردنەوەی دەرگای کارتۆنەکە. ئەوەش وا دەکات کە بە ماوەيەکی کەمتر پشيلەکە بتوانێت دەرگاکە بکاتەوە. ئەوەی ڕاستی بێت ئێمە لە ژيانی ڕۆژانەماندا بەو ڕێگايە فێری زۆر شت دەبين بۆ نمونە بۆ ئەوەی پەروانەی پانکەی سەر زەوی پاك بکەينەوە، لەوانەيە لە جاری يەکەمدا هەندێك بورغی پانکەکە دەکەينەوە کە هيچ يارمەتيمان نادەن لە کردنەوەی پەروانەکەی،

واته هەوڵێکی بێ سوودە. بۆیە لە جاری دووەمدا ئەگەر پەروانەی پانکەکەمان پاك کردەوە، خۆمان بەو بورغیانە خەریك ناکەین، واتە هەوڵە سەرنەکەوتووەکان دووبارە ناکەینەوە، وبەو شێوەیە لە کاتێکی کورتر وبە هەوڵێکی کەمتر کارەکە ئەنجام دەدەین.

تۆرەندایك سێ یاسای سەرەکی هەیە دەربارەی فێربوون کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. یاسای پاشماوە (قانون الأثر): واتە مرۆڤ یان ئاژەڵ ئەو وەڵامدانەوانە هەڵدەبژێرێت کە دەیگەێنە باری تێربوون، ئەوەش ئەوە دەگەێنێت کە ئەنجامی وەڵامدانەوەکەیە کە مانەوە ونەمانی ئەو وەڵامدانەوەیە دیاریدەکات. ئەنجامی وەڵامدانەوەش یان خۆشە یان ناخۆشە، ئینجا ئەنجامی خۆش پەیوەندی نێوان وریاکەرەوە ووەڵامدانەوە بەهێز دەکات وئەنجامی ناخۆشیش ئەو پەیوەندیە لاواز دەکات. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت تۆرەندایك بەشی دووەمی ئەو یاسایەی گۆڕی، وگەیشتە ئەوەی کە مەرج نییە ئەنجامی ناخۆش پەیوەندی نێوان وریاکەرەوە ووەڵامدانەوە لاواز بکات.

٢. یاسای مەشق کردن (قانون التدریب): مانای ئەو یاسایە ئەوەیە کە پەیوەندی نێوان وریاکەرەوە ووەڵامدانەوە بەهۆی مەشق کردن بەهێز دەبێت وئەگەر مەشقی لەسەر نەکرێت لاواز دەبێت بۆ نمونە ئەگەر زیاتر لە جارێك هۆنراوەیەك دووبارە نەکەینەوە، ئەوا پێمان لەبەر ناکرێت وئەگەر وازمان لێهێنا ومەشقمان لەسەری نەکرد ئەوا لە یادمان دەچێتەوە. بەڵام جێی ئاماژە پێکردنە کە تۆرەندایك ئەو یاسایەی هەڵوەشاندەوە لە ئەنجامی چەند تاقیکردنەوەیەك کە چەوتی ئەو یاسایەی دەرخست.

٣. یاسای ئامادەبوون (قانون الاستعداد): مەبەست لەو یاسایە ئامادە بوونی مرۆڤ یان ئاژەڵە بۆ فێربوون، ئەگەر مرۆڤ ئامادەیی هەبێت بۆ فێربوون ئەوا بەرەو فێربوون دەچێت وە پێچەوانەی ئەوەش ڕاستە، واتە ئێمە ناتوانین کەسێك فێری شتێك بکەین کە ئەو کەسە ئامادە نەبێت وحەز نەکات فێری ببێت.

٢. بیردۆزی فێربوونی کرداری

داهێنەری ئەو بیردۆزە باڕۆس سکینەرە کە بڕوای وابوو فێربوون دوو جۆرە: فێربوونی مەرجدار وفێربوونی کرداری. بەڕای سکینەر جۆری دووەمیان زۆر فرەوانترە لە جۆری یەکەم. بۆ ڕوون کردنەوەی چەمکی فێربوونی کرداری نمونەیەك لە ئەزموونەکانی سکینەر لە خوارەوە باس دەکەین.

سکینەر کارتۆنێکی دروست کرد کە دوگمەیەکی تێدابوو وبەپاڵدانی ئەو دوگمەیە خواردن دەهاتە ناو کارتۆنەکە. سکینەر مشکێکی خستە ناو کارتۆنەکە کە پاش چەند جوڵانەوەیەك مشکەکە دوگمەکەی پاڵدا وئینجا خواردن بۆ مشکەکە هات. واتە مشکەکە فێربوو کە کرداری پاڵدانی دوگمەکە دەبێتە هۆی هاتنی خواردن بۆی. لێرەدا پەیوەستیەك لە نێوان وەلامدانەوەیەکی ڕانەکێشراو ووەلامدانەوەیەکی بەهێزکەر دروست دەبێت. وەلامدانەوە لای سکینەر دوو جۆرە: وەلامدانەوەی ڕاکێشراو کە وریاکەرەوەیەکی تایبەت ودیاریکراو ڕایدەکێشێت، ووەلامدانەوەی ڕانەکێشراو کە هیچ وریاکەرەوەیەکی دیارکراو یان تایبەت ڕایناکێشێت.

سکینەر گرنگییەکی زۆری بە دیاردەی بەهێزکردن دا. بەهێزکردن بریتییە لە هەر کردارێك کە وەلامدانەوەیەك بەهێز بکات ونەگەری دووبارەکردنەوەی زیاد بکات. ئەو بەهێزکەرانەش یان ئیجابین یان سەلبین. بەهێزکردنی ئیجابی بریتییە لە ئەنجامی هەر ڕەفتارێك کە دەبێتە هۆی زیاد کردنی ئەگەری دووبارە ڕوودانی ئەو ڕەفتارە بەلام بەهێزکردنی سەلبی ئەو کاتە پەیدا دەبێت کاتێك ئەنجامی ڕەفتارێك بریتی دەبێت لە لابردنی یان دوورکەوتنەوە لە ڕووداوێکی نێگەتیف یان ناخۆش[٦].

سکینەر لەگەڵ فرستەری هاوڕێی خشتەیەکیان بۆ بەهێزکردن دانا کە گرنگتر جۆریان ئەمانەی خوارەوەن:

خشتەی ڕێژەیی نەگۆڕ: بەپێی ئەو خشتەیە بەهێزکەر (بۆ نمونە خواردن) پێشکەش دەکرێت تەنها پاش ژمارەیەکی دیاریکراو لە وەلامدانەوە. نمونەی ئەو خشتەیە ئەوەیە کە هەرجارێك بەرگدرووێك شەش کراس دەدورێت (واتە ژمارەیەکی دیاریکراو لە وەلامدانەوە یان ڕەفتار) پارەی پێ دەدرێت (بەهێزکەر).

[٦] Lahey. B. (٢٠٠٤). *Psychology: An introduction*. P:٢٠٦, ٢١٢.

خشتەی ڕێژەیی گۆڕاو: لێرەدا بەهێزکەر پێشکەش دەکرێت پاش چەندەها ژمارەی جیاواز لە وەڵامدانەوە. قومارکردن نمونەی بەکارهێنانی ئەو جۆرە خشتەیەیە چونکە لەکاتی قومار کردن بابای قومارکەر نازێت کەی دەباتەوە (بردنەوە بریتییە لە بەهێزکەر) بۆیە بەردەوام دەبێت لە هەوڵدان ویاریکردن. لە نمونەی مشککەی سکینەر، لەوانەیە جارێك پاش ئەوەی مشکەکە سێ جار پاڵ بە دوگمە دەنێت ئینجا خواردنی بۆ دێت بەڵام لە جاری دووەم پاش پێنج پاڵدان بۆی دێت وجاری سێیەم پاش دە پاڵدان وهەروەها.

خشتەی کاتی نەگۆڕ: ئەو خشتەیە لەسەر ژمارەی وەڵامدانەوە دانەمەزراوە بەڵکو لەسەر تێپەڕبوونی کات. لەو جۆرە خشتەیە بەهێزکەر پێشکەش دەکرێت پاش ڕوودانی یەکەمین وەڵامدانەوە لەدوای تێپەڕبوونی کاتێکی دیاریکراوی نەگۆڕ. موچەی مامۆستا بریتییە لە نمونەیەك بۆ ئەو جۆرە خشتەیە چونکە مامۆستا لە کۆتایی هەموو مانگێك (کاتێکی نەگۆڕ) موچەکەی وەردەگرێت (لێرەدا موچە بەهێزکەرە).

خشتەی کاتی گۆڕاو: لەو خشتەیەدا بەهێزکەر پێشکەش دەکرێت پاش یەکەمین وەڵامدانەوە کە لە چەند ماوە وکاتێکی گۆڕاودا ئەنجام دەدرێت. ماسی گرتن نمونەی ئەو جۆرە خشتەیەیە، چونکە بابای ماسیگر نازانێت چ کاتێك ماسیەك پێوەدەبێت لەوانەیە ماسی یەکەم لە ماوەی پێنج خولەك بێت بەڵام ماسی دووەم پاش سێ خولەك وەی سێیەم پاش پەنجا خولەك وهەروەها[٧].

## کۆمەڵەی سێیەم: بیردۆزە مەعریفیەکان

١. بیردۆزی تێبینین (الاستبصار یان Insight): ئەو بیردۆزە دەگەڕێتەوە بۆ دەمەزرێنەرانی قوتابخانەی گشتاڵت: ڤێرتهێمەر وکۆفکا وکۆهلەر. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو بیردۆزە با تەماشای یەکێك لە تاقیکردنەوەکانی کۆهلەر بکەین کە لەسەر مەیمون ئەنجامیدا.

٧ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە ٢٠٩-٢١٠.

کۆمەڵەر مەیمونێکی لەناو قەفەس دانا کە چەند سندوقێکی بەتاڵی پەرت وبڵاوی تێدابوو وهەندێك مۆزیشی بە بنمیچی قەفەسەکە هەڵواسیبوو بەڵام مەیمونەکە دەستی نەدەگەیشتێ. دیارە مەیمونی برسی چەند جارێك پازی دا بۆ ئەوەی مۆزەکانی لێبکاتەوە بەڵام دەستی نەدەگەیشتێ. مەیمونەکە کەمێك داما ودوایی یەکسەر یەکێك لە سندوقەکانی هێنا ولەژێر پێی دانا بەڵام هەر نەدەگەیشتە مۆزەکە. ئەو جارەش کەمێکی تر داما وپاشان سندوقێکی تری هێنا ولەسەر سندوقی یەکەمی دانا وبەسەریان کەوت ومۆزەکەی هێنا. ئەگەر جارێکی تر ئەو مەیمونە لە هەمان بار وزروف خۆی ببینێتەوە، ئەوا بێ یەك ودوو سندوقەکانی لە سەر یەکتر دادەنێت ومۆزەکە لێدەکاتەوە، بەمانایەکی تر، ئەو مەیمونە فێری چۆنیەتی گەیشتنە مۆز بوو یان توانی کێشەیەك چارەسەر بکات (کە گەیشتنە بە مۆز کە لە شوێنێکی هەڵواسرابێت). با بزانین خاوەنی ئەو بیردۆزە چۆنە ئەو دیاردەیە لێکدەدەنەوە؟

بە پێی بۆچوونی گیشتالتیەکان، ئەو مەیمونەی کە تاقیکردنەوەکەی لەسەر کرا، یەکەم جار خۆی بەرامبەر گیروگرفتێك یان بوارێك (موقف یان مجال بە زمانی عەرەبی) دۆزیەوە کە توخمەکانی یان بەشەکانی دیارن کە بریتین لە مۆز وسندوق وماوەی نێوان مۆزەکە وزەوی وهتد.. بەڵام ئەو توخمانە رێك نەخرا بوون ولێرەدا مەیمونەکە هەڵستا بە رێکخستنی توخمەکانی بوارەکەی یەکەم جار لە مێشکی خۆی وپاشانیش جێبەجێ کرد. دەتوانین کرداری فێربوون بە پێی بیردۆزی تێبینین لە چەند خاڵێك کورت بکەینەوە وبەو شێوەی خوارەوە:

- ناسینی توخمەکانی بواری زانین وبەکارهێنانی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ.
- دووبارە رێکخستنی ئەو توخمانە.
- تێبینینی لەناکاو یان بەهەنگاو، واتە پاش چەند هەوڵدانێکی سەرنەکەوتوو، کە لە ئەنجامیدا فێربوون ڕوودەدات.

٢.بیردۆزی فێربوون بە هۆی تێبینی کردن (الملاحظـــة): ئەلبێرت بەندۆرای دەروونزانی ئەمەریکی یەکەم کەس بوو کە ئەو بیردۆزەی بەشێوەیکی رێك وپێك پێشکەش کرد. پوختەی ئەو بیردۆزە ئەوەیە کە ئێمە زۆربەی نەریت وهەڵوێست

ورەفتاری کۆمەڵایەتیمان لە ڕێگای تێبینی کردنی کەسانی تر فێر دەبین. ئەو جۆرە فێربوونە پێویستی بە بوونی کەسانی تر هەیە بۆ ئەوەی لاسایی بکرێنەوە یاخود بکرێنە مۆدیل Model بۆ ئەو کەسەی کە پێویستە زانیاری وەربگرێت دەربارەی ڕەفتاریان وئەو زانیاریە هەڵبگرێت بە شێوەیەکی هێمایی وبتوانێت لە دواڕۆژدا بیانهێنێتەوە یادی خۆی وپیادەیان بکە. هەروەها پێویستە پاڵنەرێك هەبێت بۆ ئەوەی مرۆڤ لاسای مۆدێلەکەی بکاتەوە.

بۆ سەلماندنی ئەو بیردۆزە، باندۆرا چەندەها تاقی کردنەوەی لەسەر ئادەمیزاد وئاژەڵ ئەنجامدا، بۆ نمونە مشکێکی لە ژووری تێبینی کردن دانا کە ئەو مشکە بتوانێت تێبینی مشکێکی تری دراوسێی بکات کە فێری کرداری جوداکردنەوە دەبێت. پاشان مشکی یەکەمیان هێنا وفێری کرداری جوداکردنەوەیان کرد وتێبینیان کرد کە ئەو مشکە بە ماوەیەك وهەوڵێکی کەمتر لە مشکەکەی دراوسێی فێری ئەو کردارە بوو. ئەوەش مانای وایە تێبینی کردن ڕۆڵی هەبووە لە فێربوونی مشکی یەکەم چونکە ئەو مشکە تێبینی مشکی دراوسێ کردبوو وکاتێك خۆی فێری هەمان کردار کرا، مشکی یەکەم هەوڵی دا لاسای مشکەکەی تر بکاتەوە بۆیە بە ئاسانتر فێری کردارەکە بوو. بە کوردیش پەندێك هەیە کە ئاماژە بۆ دیاردەی لاساکردنەوەی ئاژەڵان دەکات کە دەڵێت: ئەگەر کەر لەگەڵ کەر ببەسترێتەوە، ڕەنگیشی هەڵنەگرێت خەڵسەتی هەڵدەگرێت!

بەندۆرا تاقی کردنەوەیەکی بەناوبانگی لەسەر کۆمەڵێك منداڵێك کردکە بۆ دوو کۆمەڵە دابەشی کردن: کۆمەڵەی یەکەم چەند فلیمێکیان پێ نیشان درا کە تیادا منداڵێك بە شێوەیەکی توند وتیژ مامەڵە لەگەڵ بوکێکی پلاستیکی دەکات. کۆمەڵەی دووەم لە منداڵەکان هیچ فلیمێکیان پێ نیشان نەدرا. پاشان هەردوو کۆمەڵە خرانە ژوورێك وچەند بووکەشووشە ویاریەکیان پێدان بۆ ئەوەی یاریان پێ بکەن. منداڵەکانی کۆمەڵەی یەکەم ڕەفتاریان لە کاتی یاریکردن توندوتیژتر بوو لە منداڵەکانی کۆمەڵەی دووەم وبەندۆرا گەیشە ئەو ئەنجامەی کە منداڵەکانی کۆمەڵەی یەکەم فێری ڕەفتاری توندوتیژ بوون لە ڕێگای تێبینی کردن یان بینینی ڕەفتاری توندوتیژ.

دەتوانین بیردۆزی بەندورا لە سێ خاڵێك كورت بكەینەوە:

- مرۆڤ وئاژەڵ زانیاری لە ژینگەی كۆمەڵایەتیان وەردەگرن.
- ئەو زانیارییە بەشێوەیكی هێمایی، واتە رەمزی، هەڵدەگیرێت.
- لە كاتی بوونی پاڵنەر، ئەو زانیاریانە تەرجومە دەكرێن بۆ رەفتار.

پاش تەواو بوونی باسی گرنگترین بیردۆزەكانی فێربوون بە پێویستی دەزانم كە دووبارە بە بیری خوێنەر بهێنمەوە كە ئەو بیردۆزانە لێرەدا زۆر بە كورتی باس كراون ولەوانەیە وەك پێویست حەقی خۆیان نەدرابێت، بەڵام وابزانم توانراوە ئاماژە بۆ خاڵە سەرەكیەكانی بیردۆزەكان بكرێت وئەوەش وەك پێشەكیەك گونجاو وشیاوە.

**خۆت تاقی بكەوە!**

١. چۆن فێربوون پێناسە دەكەیت؟ چەند جۆرە فێربوون هەیە؟
٢. ئەو فاكتەرانە چین كە پێویستە هەبن بۆ ئەوەی پرۆسەی فێربوون روودات؟
٣. چیت دەربارەی تاقیكردنەوەكانی پاڤلۆڤ دێتەوە یاد؟
٤. باسی خشتەی بەهێزكردن لای سكینەر بكە؟ دەتوانیت لە ژیانی رۆژانەت نمونە بۆ هەر جۆرە بەهێزكردنێك بهێنیەوە؟
٥. دەتوانیت باسی بیردۆزی گیشتالت بكەیت لە بواری فێربوون؟ بەراوردی بكە لەگەڵ بیردۆزەكەی بەندورا.

# زیرەکی

ڕۆژانە گوێ بیستی ئەوە دەبین کە فلان کەس زیرکە یان فلان بنەماڵە منداڵەکانیان زیرەك وبلیمەتن. هەندێك جار پێشکەوتن وسەرکەوتنی کەسێك لە بوارێك لە بوارەکانی ژیان، بۆ نمونە سەرکەوتن لە قوتابخانە، وامان لێدەکات کە ئەو کەسە بە زیرەك حسێب بکەین. بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت زیرەکی وەك زاراوەیەکی دەروونزانی تەنها بواری خوێندن ناگرێتەوە بەڵکو گشت بوارەکانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە وە لەهەمان کاتیشدا مەرج نییە ئەو کەسەی کە لە قوتابخانە دواکەوتوو بێت کەسێکی دەبەنگ بێت، لەوانەیە هەندێك فاکتەری دەرەکی بوونەتە هۆی ئەوەی ئەو کەسە سەرنەکەوێت. ئەو فیتەرەی کە بە ئاسانی هۆی تێکچوونی ماشینەکەت دەزانێت وزووبەزوو چاکی دەکاتەوە ولە بواری خۆی پێشکەوتووە، ئەوا ئەو فیتەرە فیتەرێکی زیرەکە ئەگەر نەخوێندەواریش بێت! کەواتە هەرکەسێك کە بڕوانامەی بەرزی نەبێت مانای ئەوە نییە کە کەسێکی دەبەنگە وزیرەك نییە. هەوڵ دەدەین لەو بەشەدا لە ڕوانگەی دەروونزانییەوە باسی زیرەکی بکەین وبزانین چییە وچۆنە وچۆن دەپیورێت؟ پەیوەندی نێوان زیرەکی وبۆماوە چییە؟ ئایا ڕاستە ڕەگەزێك لە ڕەگەزێکی تر زیرەکترە؟ ئەو پرسیارانە وچەندەها پرسیاری تریش کە لەوانەیە زۆربەمان لەخۆمان کرد بێت ولەگەڵ خەڵکی تر گفتوگۆمان دەربارەیان کردبێت.

وەنەبێ زیرەکی مەسەلەیەکی گرنگ بێت تەنها لە بواری دەروونزانی بەڵکو پسپۆرانی بواری فەلسەفە وکۆمەڵناسی وڕامیاری وئابوری وچەندەها بواری تریش گرنگی بەو مەسەلەیە دەدن وهەر لەمێژەوە ئەو مەسەلەیە سەرنجی فەیلەسوفەکانی ڕاکێشاوە بە تایبەتی چونکە بە ئاسانی دەتوانین تێبینی نێوان مرۆڤەکان بکەین لەسەر بناغە زیرەکیان. یەکێك لەو پرسیارانەی کە فەیلەسوفەکان خۆیان پێیەوە خەریك کرد ئەوە بوو: بۆچی هەندێك خەڵك لە هەندێکی تر زیرەکترن؟ ئینجا فەیلەسوفەکان هەوڵیان دا وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە بۆ نمونە ئەفلاتون، فەیلەسوفی گریك، هۆی جیاوازی زیرەکی خەڵکی گەڕاندەوە بۆ جیاوازی ئەو کانزایەی کە لێی دروست بوون. بەڕای ئەو خەڵك لە سێ جۆر کانزا

دروست بوون: هەندێك خەڵك لە زێڕ دروست بوون کە ئەوانیش فەیلەسوفەکان وپیاوی ژیر وزیرەکەکانن، هەندێکی تر لە زیوو دروست بوون کە ئەوانیش بریتین لە سەرکردە سەربازیەکان، وهەندێکی تریش لە کانزای مس دروست بوون کە ئەوانیش خەڵکی ئاسایین.

**پێناسەی زیرەکی**

لەوانەیە ڕۆشنایی خستنە سەر کورتە مێژوویەکی چەمکی زیرەکی یارمەتیمان بدات لە پێناسەکردنێکی شیاوی ئەو چەمکە.

فەلسەفە یەکەم ڕوانگە بوو کە دیراسەتی ئەو مەسەلەیەی کرد ولەو دیراسەتانەش پشتی بە تێڕامان بەست وگرنگییەکی زۆریان دا بە لایەنی زانین لە زیرەکییدا وباس دەکرێت کە شیشرۆن، فەیلەسوفی ڕۆمانی، یەکەم کەس بوو، کە ووشەی زیرەکی (Intellegentia) بەکارهێناوە. ئەوەی ڕاستی بێت فرانسس گالتۆن، کە ئامۆزای چارلز داروین بوو، گەشەی بە چەمکی زیرەکی دا لە بواری دەروونزانی ولە کتێبەکانی بە کاری هێنا لە سەدەی نۆزدە[1].

دووەم ڕوانگە، لە ڕووی مێژووییەوە، ڕوانگەی بایۆلۆجی بوو کە تەماشای زیرەکی کرد وەك وەزیفەی خۆگونجاندنی گیانەوەر لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا. بیردۆزی گەشەکردنی داروین بناغەی ئەو ڕوانگەیەی دانا وبەناوبانگترین زانا لەو بوارەدا "هێربەرت سپێنسەر" بوو. هەروەها پاش ئەو تایبەتمەندیانە "تخصص" ی لە بواری بایۆلۆجیا سەریان هەڵدا، فسیۆلۆجیا، کە بریتیە لە زانستی فرمانی ئەندامەکان، زیاتر بایەخی بە مەسەلەی زیرەکی دا وگرنگی بە ڕۆڵی کۆئەندامی دەمار وپەیوەندی لەگەڵ توانا عەقلییەکان دا. بەناوبانگترین زانا لەو بوارە "لاشلی" و "هیب"ن.

لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتیەوە وا تەماشای زیرەکی کرا کە خۆگونجاندنە لەگەڵ کۆمەڵ وبەرهەمی کارتێککردنە (تفاعل) لە نێوان تاك وئەو کۆمەڵەی تێیدا دەژی. ژمارەیەکی زۆر لە دەروونزانەکان ئەو هەڵوێستەیان گرت وەك تۆرەندایك وبۆل.

---

[1] Lahey, *Psychology: An introduction*, p: ٢٩١.

بەڵام لە روانگەی دەروونزانیەوە، پێناسەی زیرەکی دەکرێت بە دوو کۆمەڵ[٢]:

کۆمەڵەی یەکەم بایەخ بە وەزیفەی زیرەکی دەدەن، بۆ نمونە تێرمان پێناسەی زیرەکی دەکات وەك توانای بیرکردنەوەی ڕووت (مجــرد) وکۆلڤین دەڵێت زیرەکی توانای فێربوونە چەند پێناسەیەکی تری لەو شێوەیە.

کۆمەڵەی دووەم بایەخ بە بونیادی (یان ستراتکتۆری) زیرەکی دەدەن، واتە لە چی پێك هاتووە؟ بۆ نمونە تێرستۆن دەڵێت: زیرەکی لە چەند توانایەکی عەقلی سەرەتایی پێك دێت. سپێرمان، لەلایەکی ترەوە دەڵێت: زیرەکی توانایەکی زگماکی گشتییە یان هۆکارێکە کار لە هەموو جۆرە چالاکیە عەقلییەکان دەکات.

بەڵام لەگەڵ ئەو جیاوازیەش، لەلای زۆربەی نووسەران لە بابەتی زیرەکیدا پێناسەی ستودارد بە باشترین پێناسە دەژمێردرێت چونکە لە هەموو پێناسەکانی تر گشتی ترە[٣]. ستودارد وا پێناسەی زیرەکی دەکات کە چالاکیەکی عەقلی گشتییە کە بە چەند سیفەتێك جودا دەکرێتەوە: گرانی وئاڵۆزی وڕووت کردنەوە (تجريــد) وکۆمەڵایەتی وخۆگونجاندنی بەستراو وبەهای کۆمەڵایەتی وداهێنان وکۆکردنەوەی وزە وبەربەرەکانی ئینفیعال. بەڵام بۆ ئەوەی پێناسەیەکی دیاریکراو هەبێت بۆ چەمکی زیرەکی وبەتایبەتی لە لێکۆڵینەوە سایکۆلۆجیەکان، دەروونزانەکان پێناسەی کرداری (اجرائي) یان بۆ زیرەکی داهێنا. لەم ڕوانگەیەوە زیرەکی بریتییە لەو شتەی کە تاقیکردنەوەکانی زیرەکی هەڵدەستێت بە پیوانی. ئەوەی ڕاستی بێت لە زۆربەی توێژینەوە سایکۆلۆجیەکان، پێناسەی کرداری چەمکەکان بە شتێکی گرنگ وپێویست دادەنرێت لەپاڵ پێناسە تیۆریەکان.

**سیفەتەکان مرۆڤی زیرەك**

---

[٢] دابەشکردنی تریش هەن بەڵام ئەوەیان ئاسانتر وڕوونترە.

[٣] هەندێك لە نووسەران لەو بڕوایەدان کە ئەو هەوڵانەی بۆ پێناسەکردنی زیرەکی دراون سەرکەوتوو نەبوون.

پاش پێناسەکردنی زیرەکی دەتوانین سیفەتە سەرەکیەکانی مرۆڤی زیرەك دەست نیشان بکەین کە ئەمانەی خوارەوەن:

١. هۆشیاری وئاگاداری وزوو تێگەیشتن.
٢. بە ئاسانی وبە خێرایی شت فێر دەبێت ولەخەڵکی تر بە تواناترە لە بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە فێری بووە لە ژیانی ڕۆژانەیدا.
٣. لە خەڵکی تر بە تواناترە لە زانینی پەیوەندیەکان لە نێوان شتەکان وژمارەکان هتد.
٤. توانای داهێنانی هەیە.
٥. دووربینە.
٦. سەرکەوتووە لەو بوارەی کاری تێدا دەکات، چ خوێندن بێت چ پیشەی تر..

**بیردۆزەکانی زیرەکی**

بۆ تێگەیشتن لە سروشتی زیرەکی، کۆمەڵێك بیردۆز پێشنیار کران ولەگەڵ ئەوەی کە ئەو بیردۆزانە لەیەکتر جیاوازن بەڵام زیاتر بە تەواوکەری یەکتر دادەنرێن نەوەك دژ بەیەکتر. هەروەها پەیدا بوونی ئەو بیردۆزە جیاوازانە دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێك هۆکار وەك پێشکەوتنی زانستی ئامار لە بواری دەروونزانی. لەو بەشەدا بە کورتی ئاماژە بۆ گرنگترین بیردۆزەکانی زیرەکی دەکەین.

١. **بیردۆزی دوو هۆکار:**

دەروونزانی ئینگلیزی بەناوبانگ چارلز سپیرمان (١٨٦٣–١٩٤٥) یەکەم کەس بوو کە ئەو بیردۆزەی پێشنیار کرد پاش ئەوەی چەند تاقیکردنەوەیەکی ئەنجامدا وتیایدا ئاماری بەکارهێنا لە مامەڵە کردن لەگەڵ ئەنجامی تاقیکردنەوەکانی وهەروەها سپیرمان شیکردنەوەی هۆکارەکان (التحليل العاملي) بەکار هێنا لە ئامارەکانیدا. لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکاندا، سپیرمان گەیشتە ئەوەی کە زیرەکی لە دوو هۆکار، یان فاکتەر، پێك دێت. یەکەمیان هۆکارێکی گشتییە وهێمای G بۆ بەکارهێنا کە بریتییە لەو توانایەی کە لەهەموو چالاکیە عەقلیەکان بەشدارە، یان بریتییە لە لایەنی هاوبەشە لە نێوان هەموو چالاکیە عەقلییەکان. سپیرمان بڕوای وابوو کە ئەو هۆکارە زگماکە واتە مرۆڤ فێری نەبووە ویەکەم جار ناوی لێنا توانای

جودا کردنەوە، پاشان ناوی نا نەرمی دەماری ولەدوایدا بە وزەی عەقلی ناوی برد کە بە وزەی کارەبایی دەچێت.

دووەم هۆکار بریتییە لە هۆکارە تایبەتیەکان وسپیرمان هێمای S بۆ بەکارهێنا[٤]. ئەو هۆکارانە هەروەك لە ناویاندا دیارە، تایبەتن بە لایەنێکی چالاکی عەقلی کە جیاوازە لە لایەنەکانی دیکە. سپیرمان ئەو هۆکارانەی بەو ئامرازانە تەشبیە کرد کە بە وزەی کارەباییەوە دەبەسترێن، یان بە وزەی کارەبایی کاردەکەن وەك گلۆپ وپانکە وهتد. ئەو وشێوەی خوارەوە یارمەتیمان دەدات بە ئاسانتره لەو بیردۆزە بگەین:




[٤] هێمای G کورتکردنەوەی هۆکاری گشتییە بە زمانی ئینگلیزی واتە: General factor وهێمای S کورتکردنەوەی هۆکارە تایبەتیە بە زمانی ئینگلیزی واتە: Special factor.

G - بریتییە لە هۆکاری گشتی و ...Ga, Gb, Gc بەشداری هۆکاری گشتییە لە هۆکارە تایبەتیەکان.

S - بریتییە لە هۆکاری تایبەتی و ...Sa, Sb, Sc توانای تایبەتین.

ئەوەی ڕاستی بێت بیردۆزی سپیرمان ڕەخنەیەکی زۆری لێگیرا وگرنگترین ڕەخنە هی تێرستۆن بوو کە گوتی بێجگە لە دوو هۆکار هۆکارێکی تریش هەیە کە ناوی نان هۆکارە کۆمەڵەییەکان ولەکۆتاییدا سپیرمان دانای بە بوونی ئەو جۆرە هۆکارەش نا.

٢. بیردۆزی هۆکارە هەمەجۆرەکان

خاوەنی ئەو بیردۆزە (تۆراندایک)ە کە لە هەمان کاتدا خاوەنی بیردۆزی فێربوون بە هۆی هەوڵ وهەڵەشە. بەڕای تۆرەندایك، زیرەکی بریتییە لە ژمارەیەکی زۆر لە توخم یان هۆکاری جیاجیا وهەر هۆکارێکیش بریتییە لە توانایەك لە توانا عەقلییەکان. هەرچەندە ئەو بیردۆزە زیرەکی دابەش دەکات بۆ چەند توانایەك، بەڵام بڕوای وایە کە هەندێك جۆر لە چالاکی عەقلی هەن کە چەند توخمێکی هاوبەشیان لە نێواندا هەیە.

ئەو بیردۆزە بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕی هەتا گەیشتە ئەو شێوەی کە ئێستا باسمان کرد. بۆ نمونە لە یەکێك لە قۆناغەکانی زیرەکی بۆ سێ جۆر دابەش کرد: زیرەکی رووت (بحـــرد)، زیرەکی کۆمەڵایەتی، زیرەکی میکانیکی. بەڵام لە دوا قۆناغدا زیرەکی بە هۆی سێ ڕەهەند وەسف کرد کە بریتین لە بەرزی ورووبەر ومەودا ودەتوانین بەو شێوەی خوارەوە روونی بکەینەوە:




١. مەودا: ناوەندی ئەوەیە کە مرۆڤ دەتوانێت پێی هەڵبستێت لە تەمەنێکی کاتی وعەقلی دیاریکراودا.

٢. رووبەر: سەرجەمی ئەو ئیشانەیە کە مرۆڤ دەیکات لە پلەیەکی قورسی دیاریکراو لە تاقیکردنەوەی زیرەکیدا.

٣. بەرزی: قورسی ئەو ئیشانەیە کە مرۆڤ دەتوانێت بیانکات لە تاقیکردنەوەی زیرەکیدا.

### ٣. بیردۆزی هۆکارە سەرەتاییەکان

لویس تێرستون ئەو بیردۆزەی پێشنیار کرد کە دەکەوێتە نێوان ئەو دوو بیردۆزە کە باسمان کردن، واتە بیردۆزی دوو هۆکار وبیردۆزی هۆکارە هەمەجۆرەکان، چونکە ئەو بیردۆزە وا تەماشای زیرەکی ناکات وەك بەرهەمی ژمارەیەکی زۆر لە هۆکارەکان یان بەرهەمی هۆکارێکی گشتی بەشدار لە هەموو چالاکیە عەقلیەکان، بەڵکو زیرەکی لە روانگەی ئەو بیردۆزە بریتییە لە هۆکارێکی سەرەتایی کە بەشدارە لە هەندێك لە کردارە عەقلیەکان ولە هەندێکی تری بەشداری ناکات. ئینجا

ئەو کردارە عەقلییانەی کە بەشداریان تێدا دەکات بە یەکیان دەبەستێت ویەیەکی دەروونی ووەزیفیان دەداتێ کە لەو کردارانە جودایان دەکاتەوە کە ئەو هۆکارە سەرەتاییە بەشداریان ناکات، بۆیە ئەو جۆرە کردارە عەقلیانە هۆکاری تایبەتیان هەیە. تێرستۆن حەوت هۆکاری سەرەتایی دیاریکرد کە بریتین لەوانەی خوارەوە:

- هۆکاری تێگەیشتن: واتە تێگەیشتنی ئەو بیروڕایانەی کە بە قسە گوزارشت دەکرێن.
- هۆکاری جێگازانین: بریتییە لە توانای بیرکردنەوە لە دوو یان سێ رەهەند، وهێنانەوەیادی شت لە کاتی پێویست وڕوون کردنەوەی ئەو پەیوەندیانەی کە کۆمەڵێك شت بەیەکەوە دەبەستن.
- هۆکاری استدلال[٥]: توانای چارەسەرکردنی گیروگرفتە لۆجیکیەکان ودووربینی ونەخشە کێشان وخۆگونجاندن لەگەڵ بارو زروفە گۆڕاوەکان.
- هۆکاری کارەمەیی نمرەیی: توانای چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی کە پەیوەندیان بە نمرە وژمارە هەیە بە خێرایی وبە ووردی.
- هۆکاری زمان براوی: واتە توانای دەربڕینی بیروڕا بە ئاسانی چ لە شێوەی قسە کردن یان نووسین.
- هۆکاری یادکردنەوە: واتە توانای هێنانەوە یادی ڕووداوی رابردوو گوتنەوەی ئەو شتانەی کە پێشتر لەبەرکراون وەك هۆنراوە.
- هۆکاری زووزانین: واتە توانای پەی پێ بردن بە شتی وورد ودۆزینەوەی لایەنی لەیەك چوون وجیاوازی نێوان شتەکان بە خێرایی.

هەرچەندە ئەو هۆکارە لەیەکتر جودان بەڵام وادیارە کە پەیوەندیان لەگەڵ یەکتردا هەیە ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە وادابنێن کە لەوانەیە هۆکارێکی گشتی هەبێت بەڵام تێرستۆن هیچ گرنگیەکی بەو خاڵە نەدا. ئەوەی ڕاستی بێت هەندێك لە

[٥] استدلال لە فەلسەفەدا مانای وایە کە لە پێشەکی ڕاست هەڵبەتە دەگەینە ئەنجامی ڕاست.

دەروونزەکان وەك گیلفۆرد پێشنیار دەکەن کە مرۆڤ نزیکەی ١٥٠ توانای عەقلی هەیە[٦]!

### ٤. بیردۆزی فرە زیرەکی:

هاوارد گاردنەر وای بۆ دەچێت کە زیرەکی چەند چەشنێکی هەیە کە هەر چەشنێکیش سەربەخۆیە وبە ئەوی تر نەبستراوە. گاردنەر ئەو بیردۆزەی پێشنیار کرد پاش ئەوەی تێبینی کرد کە ئەو کەسانەی بەشێك لە مێشکیان تووشی نەخۆشی بووە، هەندێك توانای عەقلیان لە دەست داوە بەڵام هەندێك توانای تر هەروەکو خۆی ماوە. بۆیە گاردنەر هەشت جۆرە زیرەکی دەست نیشان کرد کە بریتین لە:

١. زیرەکی زمانەوانی،

٢. زیرەکی لۆجیکی وماتماتیکی،

٣. زیرەکی مۆسیقی،

٤. زیرەکی زانینی جێگا،

٥. زیرەکی جولەیی (وەرزشی)،

٦. زیرەکی کۆمەڵایەتی،

٧. زیرەکی خودی (بۆ نمونە لە خۆگەیشتن وخۆ گەیشتن).

٨. زیرەکی سروشتی (واتە تێگەیشتنی شێوە وجۆرەکان لە سروشتدا)[٧].

### ٥. بیردۆزی سێ لایەنی

ئەوە یەکێکە لە بیردۆزە نوێیەکان کە لەلایەن رۆبەرت شتێرنبێرگ پێشنیار کرا. شتێرنبێرگ زیاتر جەخت لەسەر ئەو لایەنانە دەکات کە چەشنەکانی زیرەکی بەیەکەوە دەبەستێت. بە پێی ئەو بیردۆزە، زیرەکی لە سێ لایەن پێك دێت: لایەنێك مامەڵە لەگەڵ جیهانی ناوەوەی مرۆڤ دەکات، لایەنی دووەم مامەڵە لەگەڵ رابردووی مرۆڤ دەکات، ولایەنی سێیەم مامەڵە لەگەڵ جیهانی دەرەوە دەکات[٨].

---

[٦] Lahey, (٢٠٠٤). *Psychology: An introduction*, p: ٢٩٢.

[٧] Sternberg, R.J. (٢٠٠٣). *Cognitive Psychology*. ٣rd. ed. Australia: Thomson/Wadsworth, p.٥٠٧.

[٨] سەرچاوەی پێشوو، لاپەرە: ٥٠٨.

بەهەمان شێوە زیرەکی لە سێ توانا پێك دێت کە بریتین لە توانای شیکردنەوە، توانای داهێنان، وتوانای پراکتیکی. بە هۆی توانای شیکردنەوە دەتوانین ئەو کێشانە چارەسەر بکەین کە ئاشنان ئەوەش بە هۆی بەکارهێنانی جۆرە ڕێگایەك کە توخمەکانی کێشە ئاڵوگۆر دەکات یان پەیوەندی نێوان ئەو توخمانە دەگۆڕێت. توانای داهێنان یارمەتیمان دەدات کە چارەسەری کێشەی نوێ بکەین کە پێویست دەکات بە شێوەیەکی نوێ بڕوانینە کێشەکە وتوخمەکانی. توانای پراکتیکی بریتی لە بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە دەیزانین لە چارەسەرکردنی کێشەی ڕۆژانەمان.

ئەوەی ڕاستی بێت بیردۆزی تریش هەن دەربارەی زیرەکی، وەك بیردۆزی هەرمی کاتل وڤێرنون وکارول، بەڵام لەبەر ئەوەی مەبەست لەو کتێبە ئەوەیە کە ببێتە پێشەکی، لێرەدا باسیان ناکەین وخوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەی تایبەت بۆ زنیاری زیاتر دەربارەی بیردۆزەکانی زیرەکی.

**زیرەکی لە نێوان ژینگە وبۆماوە**

ئێمە دەزانین کە هەندێك کەس لە هەندێك زیرەکترن ودەروونزانەکان هەوڵیان دا بزانن هۆی ئەو جیاوازیە چییە لە نێوان خەڵك لە پلەی زیرەکیان. هەندێك لە دەروونزانەکان هۆیەکان گەڕاندەوە بۆ بۆماوە (وراثـــة)، واتە ئەگەر دایك وباوك زیرەك بن ئەوا منداڵەکانیشیان زیرەك دەبن وپێچەوانەش ڕاستە. بۆ سەلماندنی ئەو ڕایە، دەروونزانەکان چەندەها تاقیکردنەوەیان ئەنجامدا ویەکێك لەو تاقیکردنەوانە لەسەر ئەو منداڵانە بوو کە لە خانەی بێنەوایان دەژیان. چونکە ئەو منداڵانە لە یەك ژینگە پەروەردە کراون، بۆیە ئەگەر زیرەکی بەرهەمی ژینگە بێت دەبێت ئاستی زیرەکی ئەو منداڵانە وەك یەك بێت، بەڵام ئەو دەروونزانانە تێبینیان کرد کە ئاستی زیرەکی ئەو منداڵانە لەیەکتر جیاوازە، ئینجا گەیشتنە ئەو ڕایەی کە ئەو جیاوازیە ئەنجامی بۆماوەیە نەك ژینگە.

دەروونزانەکانی تاقیکردنەوەی تریان لەسەر خوشك وبرای جمك ئەنجامدا وبەراوردیان کردن لەگەڵ ئەو خوشك وبرایانەی کە جمك نین، وئەو منداڵانەی کە پەیوەندیەکی خزمایەتیان لەگەڵ یەکدا هەیە وئەوانەی کە هیچ پەیوەندیەکیان

لەگەڵ یەك نییە. ئەو جۆرە دیراسەتانە پشتی بە رێبازی پەیوەستی بەستووە وئەنجامی لیكۆڵینەوەی ئاماری بەو شێوەی خوارەوە بوو:

خشتە ٢: پلەی پەیوەستی نێوان ئاستی زیرەكی بە پێی پلەی بۆماوە

| ژ | گروپەكان | پلەی پەیوەستی |
|---|---|---|
| ١. | منداڵە جمكە لەیەك چووەكان | ٩٠٪ – ٩٥٪ |
| ٢. | منداڵە جمكە لەیەك نەچووەكان | ٦٥٪ – ٨٠٪ |
| ٣. | خوشك وبرا ئاساییەكان | ٣٥٪ – ٥٠٪ |
| ٤. | ئەو كەسانەی كە پەیوەندی خزمایەتیان هەیە | ٢٨٪ – ٣٥٪ |
| ٥. | ئەو كەسانەی كە هیچ پەیوەندی خزمایەتیان نییە | سفر |

لە خشتە ٢ پەیوەندی زیرەكی نێوان منداڵە جمكە لەیەكچووەكان، واتە ئەوانەی كە لە ئەنجامی كەرت بوونی یەك هێلكەی پیتراو پەیدا بوون، واتە پەیوەندی بۆماوەییان گەلێك بەهێزە، بەهێزترە لە پەیوەستی نێوان منداڵە جمكە لەیەكنەچووەكان، واتە ئەوانەی كە لە ئەنجامی پیترانی دوو هێلكە بە یەك سپێرم پەیدا بوون. هەروەها پەیوەندی نێوان ئەو منداڵە جماكانە بە هێزترە لەو خوشك وبرایانەی كە جمك نین. كەواتە ئەو خشتە بۆمان دەسەلمێنێت كە بۆماوە دەورێكی گرنگی هەیە لە زیرەكی مرۆڤدا.

بەڵام هەندێكی تر لە دەروونزانەكان بڕوایان وایە كە بۆماوە هیچ دەورێكی نییە لە دیاریكردنی ئاستی زیرەكی مرۆڤ. بۆ نمونە دەروونزانە سلوكیەكان بڕوایان وایە كە زیرەكی ئەنجام وبەرهەمی كارتێكردنی دەوروبەرە ویەكێك لە بەڵگەكانییان ئەو خشتەیەی رابردووە. چونكە بە پێی بۆچوونی ئەوان ئەگەر زیرەكی بەرهەمی بۆماوە بوایە دەبوایە پەیوەستی نێوان منداڵە جمكەكان ١٠٠٪ بوایە، بەڵام هەروەكو لە خشتەكە دیارە پەیوەستیەكە ١٠٠٪ نییە، كەواتە دەوروبەر وژینگە كاری خۆیان دەكەن. بەڵگەی دووەمیان بریتییە لەوەی كە ئەو منداڵە جمكانە لە

یەك ژینگە پەروەردە کراون، بۆیە هۆی بەهێزی پەیوەستی نێوان پلەی زیرەکیان دەگرێتەوە بۆ ژینگەی هاوبەشیان نەوەك بۆماوەیان.

لە نێوان ئەو دوو جەمسەرە، دۆنالد هیب بیردۆزێکی پێشنیار کرد کە ئەو دوو جەمسەرە بەیەکەوە دەبەستێتەوە. بەکورتی، هیب زیرەکی کرد بە دوو بەش: زیرەکی أ کە زگماکە وپەیوەندی بە مێشکی منداڵەوە هەیە لە کاتی لە دایك بووندا وجیاوازی نێوان تاکەکەسەکان لەو جۆرە زیرەکییە دەگەڕێتەوە بۆ فاکتەری بۆماوە، زیرەکی ب لە دەوروبەر وەرگیراوە وبەگۆڕانی ژینگە ئەویش دەگۆڕێت، واتە زیاد وکەم دەبێت.

**پێوەرەکانی زیرەکی**

ئایا دەتوانین زیرەکی مرۆڤ بپیوین؟ چۆن؟

شتێکی بەڵگەنەویستە کە ئێمە ناتوانین زیرەکی بپیوین وەك چۆن کیلۆیەك تەماتە دەپیوین، چونکە زیرەکی شتێکی ماددی بەرجەستە نییە بەڵکو ئێمە لە ڕێگای رەفتارەوە دان بە بوونی دادەنێین. بۆیە دەروونزانەکان هەندێك تاقیکردنەوەیان داهێنا بۆ پیوانی زیرەکی وئەو تاقیکردنەوانە بریتین لە چەند پرسیارێك کە لەو کەسە دەکرێت کە دەمانەوێ پلەی زیرەکی بپیوین یاخود بریتیین لە چەند کردارێك کە ئەو کەسە پێویستە پێی هەڵبستێت وەیان هەردوو جۆری تێدایە، واتە هەم پرسیارە وهەم کردار، ودەشێت ئەو تاقیکردنەوانە بە شێوەیکی تاکی بێت یان بە کۆمەڵ.

یەکەم پێوەری زیرەکی لەلایەن دەروونزانی فەرەنسی ئەلفرید بینێ (١٨٥٧–١٩١١) دانرا پاشان چەندەها پێوەری تری زیرەکی داهێنران وەك پێوەری ویکسلەر وپێوەری نیگارکێشانی پیاو وهتد.. هەر پێوەرێك بریتییە لە چەند تاقیکردنەوەیەك کە بەپێی تەمەن دابەش کراوە، واتە بۆ هەر تەمەنێك چەند تاقیکردنەوەیەکی دیاریکراو هەیە هەرکەسێك لەو تەمەنە بێت ئەوا ئەگەر ئاستی زیرەکی ئاسایی بێت ئەوا دەتوانێت بە ڕاستی تاقیکردنەوەکە ئەنجام بدات. بۆ نمونە ئەگەر منداڵێك توانی ئەو تاقیکردنەوانە ببڕێت کە بۆ تەمەنی منداڵی دەساڵی دانراوە، ئەوا دەڵێین ئەو منداڵە تەمەنی عەقلی ١٠ ساڵە. بەڵام ئەو ئەنجامە هیچ سوودێکی نییە

ئەگەر تەمەنی منداڵەکە نەزانین واتە تەمەنی زەمەنی، واتە ئەو کاتەی کە لە دایک بووە. ئینجا بە بەراورد کردنی تەمەنی عەقلی بە تەمەنی زەمەنی دەتوانین ئاستی زیرەکی منداڵەکە دیاری بکەین. ئەگەر ئەو منداڵەی نمونەی سەرەوە تەمەنی دە ساڵ بێت ئەوا دەزانین کە ئاستی زیرەکی مامناوەندیە بەڵام ئەگەر تەمەنی هەشت ساڵ یان نۆ ساڵ بوو، ئەوا دەتوانین بڵێین کە ئاستی زیرەکی ئەو منداڵە بەرزترە لە منداڵانی هاوتەمەنی خۆی، واتە منداڵێکی زیرەکە بەڵام ئەگەر منداڵەکە تەمەنی یازدە یان دوازدە ساڵ بوو ئەوا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئاستی زیرەکی ئەو منداڵە نزمە. ڕێژەی زیرەکی بریتییە لە دابەشکردنی تەمەنی عەقلی لەسەر تەمەنی زەمەنی وئەنجامەکەش لە ١٠٠ دەدەین واتە:

ڕێژەی زیرەکی = تەمەنی عەقلی/تەمەنی زەمەنی X ١٠٠

بۆ نمونە ئەگەر تەمەنی عەقلی منداڵێك ١٠ ساڵ بێت وتەمەنی زەمەنیشی ٨ ساڵ بێت، ئەوا ڕێژەی زیرەکی ئەو منداڵە بەو شێوەی خوارەوە دەبێت:

ڕێژەی زیرەکی = ٨/١٠ X ١٠٠ = ١٢٥

ئەوەی ڕاستی بێت دەروونزانەکان ڕێژەی زیرەکیان بۆ چەند پلەیەك دابەش کردووە وبەو شێوەی خوارەوە:

خشتە ٣: دابەش کردنی ڕێژەی زیرەکی

| ڕێژەی زیرەکی | پلە |
|---|---|
| ١٤٠ وزیاتر | بلیمەت |
| ١٣٠–١٣٩ | زۆر زیرەك |
| ١٢٠–١٢٩ | زیرەك |
| ١١٠–١١٩ | سەرەوەی مامناوەندی |
| ٩٠–١٠٩ | مامناوەندی |
| ٨٠–٨٩ | ژێر مامناوەندی |
| ٧٠–٧٩ | گێل |
| ٦٩ وکەمتر | دواکەوتوو |

بەپێی ئەو خشتەیەی سەرەوە دەتوانین ئەو منداڵەی کە لە نمونەکە باسمان کرد بە منداڵێکی زیرەك لە قەڵەم بدرێت. بەڵام ئایا ئاستی زیرەکی لە نێوان خەڵکدا چۆن دابەش کراوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەروونزانەکان چەندەها تاقیکردنەوەیان ئەنجامدا وتا ڕادەیەك گەیشتنە هەمان ئەنجام ئەویش ئەویە کە دابەش بوونی ڕێژەی زیرەکی لەسەر خەڵك بە شێوەیەکی چەماوەیی زەنگوڵییە. ئەو شێوەی خوارەوە بریتییە لە دابەش بوونی ڕێژەی زیرەکی لەسەر ٣١٨٤ منداڵ:

**دابەش بوونی**

**ڕێژەی زیرەکی منداڵان**




بە پێی ئەو شێوەی سەرەوە دەتوانین تێبینی بکەین کە نیوەی منداڵەکان ٥٠٪ مامناوەندین لە ئاستی زیرەکیان و١٤,٥٪ ئاستیان لە خوار مامناوەندیە و ١٤,٥٪ تریش ئاستیان لە سەرەوەی مامناوەندیە. ٧٪ منداڵەکان زیرەکن وهەمان ڕێژەش گێلن و ٣٪ ی منداڵەکان زۆر زیرەکن وهەمان ڕێژەش زۆر دواکەوتوون. کەواتە زۆربەی خەڵك کەوتونەتە ناوەڕاست وئاستی زیرەکیان مامناوەندیە وژمارەیەکی کەم کەوتونەتە ئەم بەرو ئەو بەری چەماوەکە کە بریتین لە کەسانێك یان ئەوتە زۆر زیرەکن ئەگەر بکەونە لای ڕاستی چەماوەکە ویان زۆر دواکەوتوون ئەگەر بکەنە لای چەپی.

ئەوەی ڕاستی بێت هەرچەندە پێوەرەکانی زیرەکی بە وردی دانراون بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین بە تەواوی پشتیان پێ ببەستین. ناتوانین بە جێ بەجێ کردنی یەکێك لەو پێوەرانە بگەینە ئەنجامێکی ڕاست وتەواو چونکە ئەو پێوەرانە لە زۆر لایەن کەم وکورتیان هەیە کە ناتوانین لێرەدا بەدرێژی بکەین بەڵام تەنها نمونەیەك دەهێنینەوە ودەڵێین لەوانەیە ڕێژەی زیرەکی کەسێك پاش جێ بەجێ کردنی پێوەری ستانفۆرد بینێ جیاواز بێت لەگەڵ ڕێژەری زیرەکی هەمان کەس پاش جێ بەجێ کردنی پێوەری وێکسلەر. لەوانەیە هۆی جیاوازیەکەش ئەوە بێت کە پێوەری یەکەم هەندێك توانا دەپیوێت وپێوەری دووەمیش هەندێك توانای تر دەپیوێت. بەڵام لەگەڵ ئەو ڕەخنانەش کە لە پێوەرەکانی زیرەکی گیراون، ئەو پێوەرانە هەر پێویستن وگەیشتوونە ئاستێکی باش لە وردی وزانستی بەڵام وەك وردی ڕاستە نییە چونکە هەروەکو گوتمان زیرەکی شتێکی مادی بەرجەستە نییە کە بتوانین بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بیپیوین بەڵکو بە شێوەیەکی لاوەکی دەپیورێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانێت مرۆڤەکان بە پێی ئاستی زیرەکیان پۆلین بکات وسوودێکی زۆری هەیە لە بواری خوێندن وپیشەسازی چەندەها بواری تریش.

**پەیوەندی زیرەکی بە چەند فاکتەرێك**

دەروونزانەکان هەوڵیان داوە بزانن کە زیرەکی چ پەیوەندیەکی هەیە بە کۆمەڵێك فاکتەر وەك تەمەن ورەگەز وئیتنیك؟ ئینجا ئەگەر پەیوەندییش هەبێت، ئایا ئەو پەیوەندیە ئیجابییە یان سەلبییە؟

١. زیرەکی وتەمەن: دەروونزانەکان لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکانیان گەیشتنە ئەوەی کە پەیوەندیەکی ئیجابی بەهێز لە نێوان زیرەکی وتەمەن هەیە لە سەرەتای ژیاندا، واتە هەرچەندە مرۆڤ زیاتر گەشە بکات زیرەکتر دەبێت. بەڵام بە ڕای هەندێك لە دەروونزانەکان ئاستی زیرەکی لە تەمەنی هەژدەساڵیدا دەوەستێت وهەندێکی تر دەڵێن لە تەمەنی شازدە ساڵی گەشەکردنی زیرەکی مرۆڤ تەواو دەبێت هەروەك چۆن جەستەی مرۆڤ لە بیست ساڵی لە گەشە کردن دەوەستێت. وێکسلەر لە لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی ئەو مەسەلەیە تێبینی ئەوەی کرد کە زیرەکی گەشە دەکات تا تەمەنی سی ساڵی پاشان دەوەستێت ولە تەمەنی پیریدا،

واتە پاش پەنجا ساڵی، ئاستی زیرەکی نزم دەبێتەوە ولەوانەیە یەکێك لە هۆیەکانی نزم بوونەوەی ئاستی زیرەکی مردنی هەندێك لە نیۆرۆنەکان بێت لە مێشکدا بە هۆی پیر بوون. بەڵام هەندێك دیراساتی تر وا پیشان دەدەن کە زیرەکی تاکو پەنجاساڵیش گەشە دەکات بەتایبەتی لای مرۆڤی بلیمەت وزیرەکەکان. بە رەچاوکردنی ئەنجامە جیاوازەکانی ئەو دیراسەتانەی لەو بوارە ئەنجام دراون دەتوانین بڵێین کە هەندێك تواناکان، وەك کارامەیی دەستی وبەیادهاتنەوە، لەوانەیە لە تەمەنی پەنجا ساڵی وبەرەو سەرەوە کز ولاواز ببن، وهەندێك توانای عەقلی تر وەك بیرکردنەوە یان بەرهەمهێنانی شاکاری ئەدەبی وهونەری پاش تەمەنی پەنجا ساڵی دەست پێدەکات. لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازیەکی زۆر لە نێوان تاکەکەسەکاندا هەیە لەو بوارەدا.

٢. **زیرەکی ورەگەز:** ئایا جیاوازی هەیە لە نێوان کوڕان وکچان لە ئاستی زیرەکیان؟ واتە ئایا رەگەزێك لە رەگەزێکی تر زیرەکترە؟ ئەوەی راستی بێت دەروونزانەکان لەسەر ئەوە رێککەوتوون کە هیچ جیاوازیەکی بنەڕەتی لە نێوان کوڕان وکچان نییە لە بواری زیرەکی. بەڵام لەم دواییەدا چەند دیراسەتێك ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کە هەرچەندە جیاوازی لە نێوان کوڕان وکچان نییە لە زیرەکی گشتی، جیاوازی هەیە سەبارەت بە هەندێك لەو توانا تایبەتیانەی کە زیرەکی پێك دەهێنن. لە خوارەوە ئاماژە بۆ ئەو توانایانە کراوە کە جیاوازن لە نێوان کوڕان وکچان.

خشتە ٤: ئەو توانایانەی کە کوڕ وکچ تیایدا سەرکەوتوون.

| | کوڕان | کچان |
|---|---|---|
| ١. | تاقیکردنەوەی بیرکاری | تاقیکردنەوەی بەیادهاتنەوە |
| ٢. | تاقیکردنەوەی جێگایی | تاقیکردنەوەی زمانەوانی |
| ٣. | تاقیکردنەوەی لۆجیکی | تاقیکردنەوەی ریزکردنی ژمارەکان |
| ٤. | ماوەی کاردانەوە | تاقیکردنەوەی زانینی جۆرەکان |
| ٥. | جوڵەی ماسولکەیی خێرا | بەستنی وشەکان بە خێرایی |
| ٦. | بەهێزی ماسولکە | نیگارکێشانی ئاوێنەیی |
| ٧. | رێکخستنی ماسولکەیی | گونجاندن بە خێرایی |

زیرەکی

| | | |
|---|---|---|
| ٨. | بەکارهێنانی ئامێر بە زیرەکی | زیرەکی لە بەکارهێنانی پەنجەکان |
| ٩. | مێژوو | خوێندنەوە |
| ١٠. | زانست | زمانی ئینگلیزی |

کە سەرنجی خشتە ٤ دەدەین دەبینین هەندێك دژیەکی (تناقض) هەیە بۆ نمونە بە پێی خشتەکە، کوڕان زیرەکترن لە بواری مێژوو ونیمە دەزانین کە زیرەکی لە مێژوو پێویستی بە توانایەکی باشی بەیادهاتنەوە هەیە بەڵام خشتەکە واپیشان دەدات کە کچان لە کوڕان بە تواناترن لە بەیادهاتنەوە؟ بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بۆ ئاشکرا دەبێت کە کوڕان سەرکەوتووترن لە بواری ڕێکخستنی نێوان ماسولکە گەورەکان ولە تاقیکردنەوەی زانست وبیرکاری ولۆجیك وکچان سەرکەوتووترن لە بواری توانای زمانەوانی، واتە فێربوون زمان، وڕێکخستنی ماسولکە بچوکەکان و لە بواری خوێندنەوە.

٣. زیرەکی ونێتنیك: دیارە پەیوەندی نێوان زیرەکی ونێتنیك بابەتی گفتوگۆیەکی گەرم بوو لە نێوان دەروونزانەکان وفەیلەسوفەکان وکۆمەڵناسەکان وکێشەکە ئەوەبوو کە ئایا ڕاستە کۆمەڵێکی ئێتنیکی لە کۆمەڵێکی تر زیرەکترە؟ ئایا ڕاستی ئێتنی ئاری لە کۆمەڵە ئێتنیەکانی تر زیرەکترە، وەك هێتلەر بانگەشەی بۆ دەکرد؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە، دەروونزانەکان چەندەها تاقیکردنەوەیان ئەنجامدا ولەو بوارەدا چەند دەروونزانێك ناوبانگیان دەرکرد وەك جێنسێن وئایزنك. ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوانە ئاماژەی بۆ ئەوە کرد کە جیاوازی هەیە لە نێوان کۆمەڵە ئێتنیەکان لە بواری زیرەکی. بەپێی جێنسێن، جیاوازی هەیە لە نێوان سپی پێست ورەش پێست لە ئەمەریکا وگوتی کە سپی پێست زیرەکترن لەکاتی بەکارهێنانی تاقیکردنەوەکانی زیرەکی. وەهۆی ئەو جیاوازیەی گەڕاندەوە بۆ بۆماوە وتا ڕادەیەکیش ڕۆڵی ژینگەی فەرامۆش کرد. بەڵام تاقیکردنەوەکانی جێنسێن ڕەخنەیەکی زۆری لێگیرا، یەکێك لەو ڕەخنانە ئەوە بوو کە ئەو دەروونزانە گرنگی بە ژینگە نەداوە وڕۆڵی زمانی فەرامۆش کردووە. هەروەها هەندێك لە دەروونزانەکان گومانیان لە ئەنجامی ئامارەکانی جێنسێن کرد وهەندێکی تریش ڕەخنەیان لەو تاقیکردنەوانە گرت کە بەکارهێنان، چونکە ئەو

پێوەرەی زیرەکی کە بەکاری هێنا بەرهەمی دیراسەت بوو لەسەر کۆمەڵێك کەسی سپی پێست، واتە ئەو نمونەیەی (عینة) کە بەکاری هێناوە بەڕاستی نوێنەرایەتی کۆمەڵگای ئەمەریکی ناکات. گروپێکی تر لە دەروونزانەکان هەرچەندە دان بەو جیاوازیە دادەنێن بەڵام دەیگەڕێننەوە بۆ جیاوازی ژینگە ودەوروبەر نەوەك بۆ بۆماوە.

کاتێك ئاوڕ لە مێژوو دەدەینەوە دەبینین کە هەر کۆمەڵەیەکی ئێتنی شارستانی خۆی دروست کردووە، ولە هەموو کۆمەڵگایەك مرۆڤی زانا وبلیمەت هەڵکەوتوون، ئەو جیاوازیەش کە لە نێوان کۆمەڵەکان تێبینی دەکرێت لە بواری زیرەکی لەوانەیە زۆربەی بگەڕێتەوە بۆ هۆکاری ژینگە ودەوروبەر نەك بۆماوە وجین وکرۆموسۆمی تایبەت بە هەر کۆمەڵێك.

**خۆت تاقی بکەوە!**

١. پێناسەی زیرەکی بکە وسیفەتەکانی مرۆڤی زیرەك بژمێرە.
٢. باسی گرنگترین بیردۆزەکانی زیرەکی بکە.
٣. چۆن زیرەکی دەپیورێت؟
٤. بەرای تۆ ئایا زیرەکی زادەی بۆماوەیە یان دەوروبەر یان هەردووکیان؟ بۆچی؟
٥. زیرەکی چ پەیوەندیەکی بەو فاکتەرانە هەیە: تەمەن، رەگەز، ئێتنیك؟

# سەرچاوەکان

**بە زمانی کوردی:**

١. **جلال خلف ژالەیی، کەسایەتی سەرکەوتوو.**

٢. **عبد الستار تاهیر شریف، قاموسی دەروونناسی.**

٣. **مسعود محمد، زاراوەسازی پێوانە.**

**بە زمانی عەرەبی:**

١. أحمد عزت راجح، **أصول علم النفس.**

٢. أندروز، **مناهج البحث في علم النفس**، ترجمة: يوسف مراد (مصر: دار المعارف، ١٩٥٩).

٣. جابر الشكري، **تاريخ العلم اليوناني** (بغداد: مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨٤).

٤. جون م. نيل و روبرت م. ليبرت، **التجريب في العلوم السلوكية**، ترجمة: موفق الحمداني وعبد العزيز الشيخ (بغداد: مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨٢).

٥. حابس العواملة وأيمن مزاهرة، **سايكولوجية الطفل: علم نفس النمو** (عمان: الأهلية للنشر والتوزيع، ٢٠٠٣).

٦. حامد عبد السلام زهران، **علم النفس النمو.**

٧. حكمت درو الحلو، زريمق خليفة العكروتي، **مدخل إلى علم النفس** (القاهرة: المكتب المصري، ٢٠٠٤).

٨. سارجنت، **علم النفس الحديث**، ترجمة: منير البعلبكي (بيروت: دار العلم للملايين، ١٩٧٩).

٩. سعد جلال، **المرجع في علم النفس** (مصر: دار المعارف، ط٧، ١٩٧٤).

١٠. صالح شيخ كمر، **الجريمة: الجوانب النفسية والعقلية للجريمة**، (بغداد: دار الشؤون الثقافية، ١٩٨٩).

١١. صالح محمد علي أبو جادو، **علم النفس التربوي** (عمان: دار المسيرة، ط٤، ٢٠٠٥).

١٢. طلعت منصور، أنور الشرقاوي، عادل عزالدين، فاروق أبو عوف، **أسس علم النفس العام**، (بدون تاريخ).

١٣. عبد الستار ابراهيم ورضوى ابراهيم، **علم النفس: أسسه ومعالم دراساته** (القاهرة: الدار العربية للنشر والتوزيع، ط٣، ٢٠٠٣).

١٤. عبد الكريم العثمان، **الدراسات النفسية عند المسلمين والغزالي بوجه خاص** (مكتبة وهبة، ط١، ١٩٦٣).

١٥. عبد المنعم الحفني، **موسوعة مدارس علم النفس**، (مكتبة مدبولي، بدون تاريخ).

١٦. عدنان يوسف العتوم، **علم النفس المعرفي: النظرية والتطبيق** (عمان: دار المسيرة، ٢٠٠٤).

١٧. عزت سيد اسماعيل، **علم النفس الفسيولوجي** (الكويت، ط٢، ١٩٨٢).

١٨. عمر محمد جبرين، **علم النفس الفسيولوجي** (الأردن: الجمعية العلمية الملكية، ط١، ١٩٧٥).

١٩. غازاد وكورسيني، **نظريات التعلم**، الجزء ٢.

٢٠. فاخر عاقل، **مدارس علم النفس** (بيروت: دار العلم للملايين).

٢١. فاخر عاقل، **التعلم ونظرياته**.

٢٢. فاضل الأزريجاوي، **أسس علم النفس التربوي**، جامعة الموصل، ١٩٩١.

٢٣. ليندا ل. دفيدوف، **مدخل علم النفس**، ترجمة: سيد الطواب، محمود عمر، نجيب خزام (نيويورك: دار ماكجروهيل للنشر، ط٤، ١٩٨٣).

٢٤. محمد أبو العلا أحمد و محمد خليفة بركات، **علم النفس** (القاهرة: مكتبة عين الشمس، ١٩٧٨).

٢٥. محمود قاسم، **في النفس والعقل لفلاسفة الإغريق والإسلام** (مكتبة الأنجلو المصرية، ط٢، ١٩٥٤).

٢٦. موريس افيلينج، **علم النفس قديما وحديثا**.

٢٧. نوربير سيلامي، **المعجم الموسوعي في علم النفس**، ترجمة وجيه اسعد، (دمشق: منشورات وزارة الثقافة، ٢٠٠١).

٢٨. ول ديورانت، **قصة الفلسفة**، ترجمة: د. فتح الله محمد، (بيروت: مكتبة المعارف، ط ٤، ١٩٨٢).

٢٩. يوسف كرم، **تاريخ الفلسفة اليونانية** (بيروت: دار القلم).



## دەربارەی دەروونزانی گشتی

د. ئازاد عەلی

هەندێك لە زانایان دەروونزانی بە زانستی سەدەی بیستەم دادەنێن. هەر چەندە ئەو رایە کەمێك زێدەرەوی تێدایە، بەڵا ئاماژە بۆ گرنگی دەروونزانی دەکات لە ژیانی مرۆڤی هاوچە ولە رۆشنبیری گشتی ونەو بوارانەی کە مرۆڤ، کاریان تێدا دەکات.

ئەو کتێبە لە چەند بابەتێکی سەرەتایی دەروونزانی گشتی پێك دێت و بە پێناسینی دەروونزانی ومێژووی ولقەکانی و قوتابخانەکانی دەست پێ دەکات وپاشان باس لە بابەتی رێگاکانی لێکۆڵینەوە دەکات. لە پاشان بابەتی هەست کردن وئاگاداری و زانین یەك لە دوای یەك دێن ولە دوای ئەو بابە پالدەرەکان دێت، ئینجا بابەتی فێربوون وبە بابەتی زیرەك کتێبەکە کۆتایی دێت. ئەو بابەتانەی کە لەو بوارەدا ماون، یارمەتی خودا، لە دەرفەتێکی تردا بڵاودەکرێنەوە. لە پاش کۆتایی هەر بابەتێك کۆمەڵە پرسیارێکم دارشتووە بۆ ئەوەی